١

مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى
وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً

# بەختەوەری

www.bextewery.net



## نامەی کوڕێک بۆ هاوسەرەکەی

## لەپێناو ژیانێکی هاوسەری باشترو بەختەوەر

## مستەفا زەمانی
## باس لەیوسفی راستگۆ دەکات



## رێبوارێک لەنێوان کات و کاردا



گۆڤارێکی مانگانەی رۆشنبیریی و پەروەردەییە ... ساڵی یەکەم ژمارە ( ١ ) ی تشرینی یەکەمی ٢٠١١

# بەختەوەری بۆ ؟



حاجی کاروان

بەختەوەری واتە(السعادة). تەنها وشەیەك نیە خولیای بین یاخود شیعری بەباڵادا هەڵبدەین یاخود ئەوەندە دووربێ ونەتوانین نزیکی بین یاخود ئەوەندە لەبەرچاوان شاراوە بێت نەیدۆزینەوە.

+ بەرای بەندە بەختەوەری بەسێ قۆناغ پێی دەگەین کەبریتین لە:

**یەکەم:** دیدگاو (تەسەوری) جوان بۆ ژیان و مردن. خاوەن تێگەیشتنی جوان و دروست بێت. ئەم دیدگایەش تەنها سەرچاوەکەی(وەحی) و (پێغەمبەرە) تانەخشەی رێگای ژیان دابرێژرێ .. کێ هەیە بەخالیقی(مخلوقە)ەکان شارەزابێ؟ ئەی کێ هەیە بەقەد پێغەمبەری خوا دڵسۆزی مرۆڤەکانی (مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً) واتە هەرکەسێك کاری جوان بکات چ نێر چ مێ. جائیماندار بێت ئەوا خۆش گوزەران دەبێت و بەختەوەری بەدەست دێنێت. کەواتە بە (کردەوەی جوان و چاك و باوەری راستەقینە)ژیان خۆش دەکات و لەوپەری حەسانەوە و بەختەوەریدا ژیان دەگوزەرێنێت.

**دووەم:** هونەری خۆبەرێوەبردن لەروی کاروباری ژیانەوە. دەبێ مرۆڤ خاوەن بەرنامەی کاربێ بۆ خۆی و. نابێ دنیا بەهەرەمەکی و گێرە شێوێنی بباتە سەر و بەئارەزووی خۆی راست و چەپ و بە(پێ خاوسی) بکەوێتە ناو چیادۆڵ و سارا. هونەری خۆبەرێوەبردن لەم چەند خاڵەی کۆتایی کورتی دەکەمەوە:

-١ - گرنگی دان بۆ خودی خۆت لەروی (فهم. عقل. جسد .. واتە تێگەیشتن و ئەقڵ و لاشە و جەستەو هتد ....).

-٢- کاروکاسبی و بروانامەو خوێندن وەزیفە و بازرگانی. ئەمانە دەبێ بەرنامەی بۆ دابنرێت. کە ئەمانەش خۆیان هۆکاری بوونی بەختەوەری ژیانن مرۆڤەکانن.

**سێیەم:** بەختەوەرکردنی مرۆڤەکان واتە هەوڵی یارمەتی دانی دەوروبەرت بدەیت و دڵی خەلکانی تر خۆش بکەیت. ئەم کارەش دەبێ لەرێی دەسەلات و حوکمرانانان بێت و هەوڵی خۆشگوزەرانی خەڵك بدەن و وڵات لە گەندەڵی و قات و قری و دواکەوتن رزگاربکەن و وڵات ونیشتمان ئاوەدان بکەنەوە تا خەڵکی بەئاسودەیی بژێێت ئەکاتە دەسەڵات دەبێت بەکەسێکی خەمخۆر و دوور لە (حزبیەت و مەنسوبیەت و مەحسوبیەت....) کەسەرەنجام وڵات لەکاوڵکاری و بەدبەختی رزگاری دەبێت و. نیشتمان دەبێت بە (مؤسسات) و سەرجەم دامەزراوەکان کاری پیشەو یاسایی خۆیان دەکەن و یاسا سەروەر دەبێت .

گۆڤارێکی مانگانەی رۆشنبیریی و پەروەردەییە
لەسەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان متمانەی
ژمارە 522ی پێبەخشراوە

خاوەن ئیمتیاز : کەنعان نەجمەددین "حاجی کاروان" 07504569263
سەرنووسەر: سوهەیب جەمیل عەلی 07504965890
Suhaibjamel@yahoo.com
www.bextewery.net

مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى
وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً

# بەختەوەری

www.bextewery.net

ساڵی یەکەم ژمارە ( ١ ) ی ئەیلولی ٢٠١١



14
..لەگەڵ خوابە
بابەختەوەر بیت



4
گوڵزاری
فەرموودە



22
دەردەکانی خەمۆکیی



37
سامی یوسف:
ئازادی هیچ کات بە بەلاش
دەست ناکەوێت!!



بەرەو بەختەوەری
16

تکایە ئەم گۆڤارە بپارێزە لەبەر ئەوەی ئایات و فەرمودەی پیرۆزی تێدایە
پێگەی بەختەوەری لەسەرتۆری ئینتەرنێت www.bextewery.net
ناونیشان: هەولێر گەڕەکی ئیسکان پشت بازاڕی هاوچەرخی نیوستی 0750 426 4848
بەشی ریکلام : 0750 496 58 90

راوێژکاری یاسایی: پارێزەر محەممەد هاودیانی
دیزاین: حوسام شێخانی
پەیوەندییەکان : عوسمان سەنگاوی 0770 145 3588
چاپ : چاپخانەی پیرەمێر د- سلێمانی

# کانیاوی قورئان

به پێنووسی : مامۆستا بورهان موحه ممەدئەمین

بەناوی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان .. ئەوەی کە جێگەی شانازی تاکی ئیماندارە، ئەوەیە کە رۆژانە لە پێنج کاتی جیاوازدا یادی پەروەردگاری دەکات و سەری رێز و نەوازشی بۆ دادەنەوێنێت و ناوچەوانی بۆ دەخاتە سەرخاك و نوێژێك ئەنجام دەدات کە پەروەردگاری لەرێگەی جوبرەئیلی فریشتەوە پێغەمبەری ئیسلامی بە جوانی لێ شارەزاکردوەو، بەهەزاران لە هاوەڵانی خواناس و دڵسۆز وەکو ئەو زاتە فێری بوون و نەوەکان بەهۆی تێهەڵکێشانەوە نەوە لەدوای نەوە گەیاندوویانە تا ئەم سەردەمەو تا کۆتایی دنیا ئیمانداران لەهەموو شوێنێکی زەویدا پیادەی دەکەن.

جا لەم عیبادەتە ناوازەدا، لەم نوێژە رێك وپێکەدا کە هەریە دیتنی سەرنجی چەندەها کەسی لەخۆرناوا راکێشاوە و کەوتوونەتە دیراسەی ئەم دینە و مسوڵمان بوون، شایانی باسە پەروەردگاری مەزن کەتەلۆکی شادبوون بەدیداری خۆی لەسەرەتای قورئانە پیرۆزەکەیدا تۆمارکردووە، تا هەرکات بمانەوێت جگە لە کاتی نوێژە فەرزەکان، بەبێ مۆڵەت بچینە (حضور) و دەروونمان کەیل و پڕ بکەین لەدەریای نوور.

بەڵێ ئەو پەروەردگارە خاوەن میهرە سورەتی (الفاتحة)ی لەبەر گرنگیی دووجارنازڵ کردووە، جارێك لە (مەککە) و جارێکیش لە (مەدینە)....

ئەوسا ئیتر مسوڵمانان بەشەوق و زەوقەوە هەرکات گوێ بیستی بانگ بووبن، دەستیان لە هەموو کاروبارێك هەڵگرتووە و بەرەو مزگەوت بەرێکەوتون، تا ساتێك دڵ و دەروونیان بسرەوێت و مێشك و هزریان بحەوێتەوە، جەستەی شەکەتیان ماندوویەتی دەرچێت.

بەڵێ ، دوای خۆ ئامادەکردن بەدەستنوێژێکی جوان رووەو قیبلە دەوەستن و دوای نوێژدابەستن و خوێندنی نزای تایبەت، دەست دەکەن بە خوێندنی سورەتی (الفاتحة) .. هەربۆیە پێویستە ئیماندارتا بۆی دەکرێت کاتێ نوێژ دەکات، کاتێ دەچێتە حوزور ئاگای لە خۆی بێت و هەوڵبدات کۆنترۆڵی خۆی بکات و بزانێت گفتوگۆ لەگەڵ کێدا دەکات و کەلیمات و وشەی پیرۆزی کێ دووبارە دەکاتەوە....!؟

بۆ ئەو مەبەستەش پێویستە پەنا ببات بۆ پەروەردگاری، تا پەنای بدات، لەو وەسوەسەو خەتەرەو خەیالانەی کەشەیتانی دوابڕاو بۆی دروست دەکەن، دیارە کە شەیتان، دوژمنی ئاشکراو نادیاری سوێخواردووە و لەکاتی نوێژدابەستنەوە تا لێ دەبێتەوە، خۆی لە لایەك و دارودەستەی لەلایەك هەمووهەوڵەکانیان دەخەنە گەڕ بۆ ئەوەی زەین و دڵ و دەروونی ئیمانداران پەرت و بڵاوبکەن و هەرچی دەشێ و ناشێ بیری بخەنەوەو نەیەڵن دڵی لای نوێژەکەی بێت، هەربۆیە پێویستە (اعوذبالله من الشيطان الرجيم) زۆر بەچاکی و بەدل و زمان بڵێین، تا ئەو پەروەردگارە مەزنە لەشەڕو وەسوەسەی شەیتانی نەفرین لێکراو بمانپارێزێت.

پاشان دەڵێین (بسم الله الرحمن الرحيم) و ناوی پیرۆزی دەبەین، (الله) بەدی هێنەری خۆمان و هەموو مەوجودات لەئاسمانەکان و زەویدا، پێویستە شکۆمەندی ومەزنی و دەسەڵاتی ئەو زاتە فەرامۆش نەکەین، ودوابەدوای ناوی پیرۆزی هەردووسیفەتی رەحمەت و دلۆڤانی میهرەبانی بڵێین، چونکە ئەو خوایەی کە ئێمەی وەستاوین لەحوزوریدا زاتێك نیە کە ئەوەندە تورەو خەشمگیر بێت هەربەندەیەکی نافەرمانی کرد خێرا تۆڵەی لێ بستێنێ و گەڕو گولی بکات و لەناوی ببات.

بەڵکو زاتێکە سۆزو رەحمەتی هەموو شتێکی گرتۆتەوە، هەتا بێ دینەکانیش لەسایەی رەحمەت و سۆزو میهری ئەو زاتەدا بەزۆری ژیانی دنیا بە خۆشی دەگوزەرێنن، بەڵام رەحمەتی

> دوابەدوای ناوی پیرۆزی هەردووسیفەتی رەحمەت و دلۆڤانی میهرەبانی بڵێین، چونکە ئەو خوایەی کە ئێمەی وەستاوین لەحوزوریدا زاتێك نیە کە ئەوەندە تورەو خەشمگیر بێت هەربەندەیەکی نافەرمانی کرد خێرا تۆڵەی لێ بستێنێ و گەڕو گولی بکات و لەناوی ببات.. بەڵکو زاتێکە سۆزو رەحمەتی هەموو شتێکی گرتۆتەوە، هەتا بآ دینەکانیش لەسایەی رەحمەت و سۆزو میهری ئەو زاتەدا بەزۆری ژیانی دنیا بە خۆشی دەگوزەرێنن .

تایبەتی و نەبڕاوەو بەردەوامی تەنها بۆ ئیماندارانە لە دونیاو قیامەتدا....

پاشان کە دەڵێت: (الحمدلله رب العالمین) هەوڵبدە لەناخەوە سوپاس و ستایش و قەدردانی بنوێنە بۆئەو پەروەردگارو زاتەی کە خاوەن و بەدیهێنەری هەمو جیهانەکانە.. جیهانی ئادەمیزاد و ڕوەك و ئاژەڵ و مارو مێروو وسەرجەم مادیات، جیهانی ئەستێرەو هەسارەو کاکێشانە زەبەلاحە بێ شومارەکان، جیهانی دیارو نادیارەکان، جیهانی فریشتە و پەری و جنۆکەو دروستکراوانی سەر سورهێنەر لەسەر زەوی و ناو زەوی و نێو دەریاو زەریاو ڕووبارو چەم و بیرەکان!!

پاشان جارێکی تر هەردوو سیفەتی (الرحمن الرحیم) دووبارە بکەرەوە کە نیشانەی فراوانی سۆزو ڕەحمەت و میهری ئەو زاتەیە کە ئەم لاوئەولای (الحمدالله رب العالمین)یان داوە....

جا سەیر لەوەدایە کە ئەو هەموو سۆز و ڕەحمەتەی کە دەیبینین لەنێوان دایك و باوك و ڕۆڵەکانیاندا، لەنێوان ژن و مێرددا، لەنێوان ئاژەڵان و بەچکەکانیاندا، لەنێوان باڵندە و بێچوەکانیاندا لەهەر بوارو لەهەر شوێنێکدا، هەرهەمووی بەشێکە لەسەدبەشی ڕەحمەت و سۆزو میهری خوایی، هەتا دایکی ئاژەڵان سەریان بەرزدەکەنەوە تا ئازاری بێچوەکانیانی هەڵدەگرێ و دەیانگوێزێتەوە، هەتا باوکە و دایکەی کەوو کۆتر و زۆربەی باڵندەکان خۆیان برسین، بەڵام هەولدەدەن بێچوەکانیان تێربێت، هەموو ئەوانە لەو بەشە ڕەحمەتەیە کە خوای گەورە بەخشیویەیەتی بەزیندەوەران، بەڵام خۆشبەختانە ئەوەدو نۆبەشی هەڵگرتووە بۆقیامەت، تایبەتیشی کردووە بۆ ئیمانداران بەگشتی و ئیماندارانی گوناهبار بەتایبەتی....

هەربۆیە دوای (الرحمن الرحیم) پێویستە بڵێین (مالك یوم الدین) واتە پادشاو سەردارو دەسەڵاتداری ڕەها لە ڕۆژی ڕەستاخێزو قیامەتدا، لەوێ و لەوکات و ساتەدا پاشاکانی زەوی و دەسەڵاتداروسەرۆك کۆمارەکان، گەداو بێ دەسەڵات و زەبوون و گیرخواردوون، مەگەر تاکەتاکەیان کە دیندارو خواناس و دادپەروەربووبن، ئەگینا لەوێ هیچ جیاوازیەکیان نیە لەگەڵ هەموونەوخەڵکەدا، بەڵکو گەر بێ دین و ستەمکاران و دەست برو فێڵبازبووبن، ئەوە لەلایەن گەل و میللەتیانەوە نەفرینیان لێ دەکرێت و قسەی ساردو سڕیان پێ دەوترێت!!

ئنجادوای ئەم ستایشەی پەروەردگار دەڵێت: (ایاك نعبد وایاك نستعین)، واتە: خوایە گیان مادەم تۆ زاتێکی ئاوا گەورەو شکۆمەندو خاوەن میهریت، ئیتر ئەوە بڕیارم داوە لەگەڵ ئیماندران، کە تەنها هەر تۆ دەپەرستن، کڕنوش و سوژدە هەر بۆ تۆ دەبەین، پشتیوانیشمان هەر تۆیت، یارمەتیدەرمان لە هەردوو جیهان هەرزاتی تۆیە، دوای ئەوە لەوزاتەدەپاڕێیتەوە و دەڵێیت: (اهدنا الصراط المستقیم) واتە: هیدایەت و ڕێنموویینم بکە بۆ ڕێگەو ڕێبازی ڕاست و دروست، بۆ ڕێبازی دینداری، بۆ ئەو ڕێگەیەی کە دەمگەیەنێتە بەهەشت و ڕەزامەندی تۆ.

(صراط الذین انعمت علیهم غیر المغضوب علیهم ولا الضالین) واتە: ڕێگەو ڕێبازی ئەوانەی کە لەناونازونیعمەتی نەبڕاوەبەهرەمەندت کردوون، لەدنیادا دڵ ئارام و ئاسوودەن، لەقیامەتیشدا ڕێز لێگیراون لەبەهەشتی پڕلەنازو نیعمەتدا.. نەك ڕێگەو ڕێبازی ئەوانەی کە خەشم و قینت لێ گرتوون بەهۆی بێ دینی و نالەباری زوڵم و ستەم و ناپاکیان، نەك ڕێگەو ڕێبازی ئەوانەش، کە گومڕاو سەرلێشێواون وشوێنی فەلسەفەو بیرۆکەی سەقەتی کەسانی وەك خۆیان کەوتوون، سەرگەردان و دەروون نەخۆش و ناخ ئاڵۆزن... دەساخوایە گیان نزاو پاڕانەوەمان گیرا بکە و بمانخەرە ریزی بەختەوەرانەوەو بەدورمان بگرە لەوانەی کە خەشم قینت لێ گرتوون، یان سەرلێشێواو سەرگەردانن.





# گوڵزاری فەرمودە

خوا بەوە خۆشحاڵ دەبێت کە یەکێك تۆبە دەکات : عەبدوللای کوڕی مەسعوود (خوای لێ ڕازبێت )دەفەرمووێت: پێغەمبەر (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت)فەرمووی: قەسەم بەخوا کە بەندەیەکی گوناهبار دەگەڕێتەوە و تۆبە دەکات خوای گەورە ئەوەندەی پێ خۆشە کەزۆر لە خۆشحاڵی ئەو پیاوە زیاترە کە بۆتان باس دەکەم :

پیاوێك لەبیابانێکی چۆڵ و پڕ مەترسی دا حوشترێکی پێ یە چی خواردن و ئاوی هەیە لەو حوشترەی بارکردووە لە شوێنێك بۆ حەوانەوە لائەدات و خەوی لێ دەکەوێت کاتێك خەبەری دەبێتەوە دەبینێ حوشترەکەی بەبارەوە ڕۆیشتووە ماوەیەکی زۆر بە دووایا دەگەڕێت زۆر تینوو دەبێت بڕیار دەدات بگەڕێتەوە بۆ شوێنەکەی خۆی سەری دەخاتە سەر باسکی و چاوەڕێی مردن دەکات کوت و پڕحوشترەکە بەخۆی و بارەوە پەیدا دەبێت. دەبێت ئەم پیاوە چەند خۆشحاڵ بێت؟ دەخوا زیاتر خۆشحاڵە بەتۆبەی بەندەکەی هەندێك لەڕاوییەکانی ئەم حەدیسە ئەمەش دەگێڕنەوە : کاتێك پیاوەکە چاوی بە حوشترەکەی دەکەوێتەوە خێرا پەلاماری دەدات لە خۆشی یانا سەری لێ نەشێوێت و هەڵە دەکات و دەڵێت خوایە تۆ بەندەی منی و منیش خوای تۆم هەزار شکور بۆ تۆ ).

**(حديث صحيح متفق عليه)** ..

بەزەیی و بەخشندەیی خوا لە ڕۆژی قیامەتدا : ئەبووسەعیدی خودری (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: چەند کەسێك لە سەردەمی پێغەمبەردا (دروود و سەلامی خوای لەسەر بێت) لێیان پرسی ئایا ئێمە لە ڕۆژی قیامەتدا دەتوانین خوای گەورە ببینین؟ ئەویش فەرمووی: (بەڵێ ئایا کەس هەیە بتوانێت ڕێگەی ئەوەتان لێ بگرێت کە خۆر ببینن لە کاتی نیوەڕۆی ڕۆژێکی بێهەور و سایەقەدا؟ یان نەهێڵێت سەیری شەوی مانگی چواردە بکەن لە شەوێکی سایەقەدا؟ وتیان: نەخێر. پێغەمبەر (دروود و سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: هەر بەو شێوەیەش کەس ناتوانێت ڕێگای ڕاستی خواتان لە ڕۆژی قیامەتدا لێ بگرێت. هەرکەس چی دەپەرستێت با بیپەرستێت، بەڵام لەو ڕۆژەدا هەر کەسێك کە لەبری خواپەرستی، بت و هەیکەلەکانی تری پەرستیبێت، ئەوا یەکسەر فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە تەنها خواپەرستەکان بە چاك و خراپەوە. دەمێننەوە لەگەڵ ئەو گاور و جوولەکانەی کە ئایینەکەیان گۆڕیوە بانگی جوولەکەکان دەکەن و لێیان دەپرسن ئیوە چیتان پەرستووە؟ ئەوانیش دەڵێن ئێمە (عوزەیر)ی کوڕی خوامان پەرستووە. ئینجا پێیان دەڵێن ئێوە درۆتان کردووە. خوا ڕۆڵەو ژن و منالی نییە ئێستا چیتان دەوێت؟ دەڵێن تینووی ئاومانە و ئاومان دەوێت. بەگاڵتەکردنەوە پێیان دەڵێن جا بۆ ناخۆنەوە؟! ئیتر بەرەو دۆزەخ ڕاو دەنرێن و بەسەر یەکدا دەکەونە ناوی. ئینجا بانگی گاورەکان دەکەن و لەوانیش دەپرسن ئەی ئێوە کێتان پەرستووە؟ ئەوانیش دەڵێن ئێمە (مەسیح)ی کوڕی خوامان پەرستووە. پێیان دەڵێن ئێوەش درۆ دەکەن، خوا خێزان و ژن و منالی نییە. ئێستا چیتان دەوێت؟ دەڵێن تینوومانە، پاشان

بەرەو دۆزەخ ڕاو دەنرێن و بەسەر یەکدا دەکەونە ناوی.

پـاش ئـەوەی کـە تـەنها خواپەرستەکان بە چاك و خراپەوە دەمێننـەوە، خـوای مـەزن بـە شـێوەیەکی تایبـەتی، خـۆی پیشانیان دەدات و دەفـەرموێت: چاوەڕوانی چی دەکەن؟ ئەوە نییە هەرکەسە و شوێنی ئـەو کەسـە دەکـەوێت کـە پەرسـتوویەتی؟ ئـەوانیش دەڵـێن خوایـە لەگـەڵ هەژاریـشمان هـەرگیز لەگـەڵ ئەوانـە نـەبووین. پاشـان دەفـەرموێت: مـن خواتـانم ئەوانیش دەڵێن ئێمە هاوبەش بۆ خـوا قـەرار نـادەین. ئینجـا دەفـەرموێت: ئێـوە هـیچ نیشانەیەکی واتان هەیە کەخوای خۆتـان پـێ بناسـنەوە؟ دەڵـێن: بـەڵێ. ئـیتر خـوا لـە شـێوەی ڕاسـتەقینە دەردەکـەوێت. موسڵمانانە ڕاستەکان هەموویان بـە (سـوجدە)دا دێـن، پاشـان هەموان سەریان بەرزدەکەنـەوە و دەڵێن: تۆ خوای ئێمەی و تۆمـان پەرستووە. ئـیتر پردێـك لەسـەر دۆزەخ دادەبەسـترێت و کـاتی شـەفاعەت و پاڕانـەوە دێـت. ئەسحابە پرسییان: ئـەی نێـراوی خوا پردی چی؟ فەرمووی شتێکی لووسـە و مـرۆڤ لێـی هەڵدەخلیـسکێت و ئـەملا و ئـەولای بـە قـولابی ئاسـن و دڕکـاوی (لـەو جـۆرەی کـە لـە "نەجـد" هەیـە) گـیراوە. موسڵمانان بەچاوترووکانێك لێـی دەپەڕنـەوە. هـی واش هەیـە بەبرینداری پێیەوە هەڵدەواسرێت و هەندێکیش بەردەبنە خـوارەوە بۆ ناو دۆزەخ. پـاش ئـەوەی کـە موسڵمانان دەپەڕنـەوە، دەکەونـە نزا و پاڕانەوە لە خوا.

داوای ڕزگارکردنی ئەوانە دەکـەن کە بەربوونـەوە بـۆ نـاو دۆزەخ و دەڵێن: خوایە، ئەوانە وەك ئێمـە نوێژ و ڕۆژوو و حەجیان دەکـرد. ئیتر لە خواییەوە دەوترێت بـڕۆن کـێ دەناسـن لـە ئـاگر دەریـان بهێـنن. خـەڵکێکی زۆر ڕزگـار دەکـەن وعـەرزی خـوا دەکـەن: کەس نەماوە لە وانەی فـەرمانی ڕزگارییانتان دا، هـەموو ڕزگـار کران. ئینجا دەفەرموێت بچنەوە کـێ بـە قـەدەر دینارێـك یـان نیودینار یـان زەڕەیـەك چاکەی هەیە، دەربێنن. هەرکەسێك تۆزە چـاکەیەکی کردبێـت، ڕزگـاری دەبێـت. (ئەبوسـەعید) دەڵێـت: ئەگەر بڕوا ناکەن ئەوە ئایەتی ان الله لایظلـم مپقـال ژرە وإن تـك حسنە یچاعفها ویؤت مـن لدنـە اجرا عقیما ﴿النساء: ٢٩﴾ واتە: خوا یەك تۆز زوڵم لەکەس ناکات چـاکەش چـەندقات پاداشـتی دەدرێتـەوە. لەگـەڵ ئەوەشـدا پاداشـتی زۆر گـەورە دەدات بـە بەندەکانی ئینجـا خـوای مـەزن دەفـەرموێت: فریـشتەکان و پێغەمبـەران و موسـڵمانان شەفاعەتی خۆیان کـرد و ئینجـا نۆبـەی خۆمـە. ئـیتر فـەرمان دەدات خـەڵکێکی زۆر لەوانـەی کـەهیچ چـاکەیان نـەکردووە لـە ئـاگری دۆزەخ ڕزگـار بکـرێن. ئەوانـە وەك کۆڵـە و ژیـان لـێ هـاتووە و بوونەتـە خـەڵووز لەڕووبارێکی بەهەشتدا کە پێـی دەوترێـت ڕووبـاری ژیـان، هەڵدەکێشرێن و سپی دەبنـەوە و وەك دوڕ دەدرەوشێنەوە. ئەوانەن کە بە(**عتقـاءالله**) نـاو دەبـرێن. ئینجـا هـەموو دەڵـێن: خوایـە، شـتی وات پـێ داویـن کـە بـە کەسـت نـەداوە. ئـەویش دەفـەرموێت لـەوەش زیاترتـان دەدەمێ. شتی وا کە لە هـەموو ئەو شتانە باشتر بێت. ئـەوانیش دەڵـێن: خوایـە چ شـتێك هەیـە لەوەی پێت داویـن باشـتر بێـت؟ دەفەرموێت: ئـەوە ڕەزامەنـدیی منـە کـە ئـیتر هـەرگیز لێتـان نـاڕازی نـابم.﴿**حـدیث صـحیح متفق علیه**﴾.



# (فَلا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ، ومَا لا تُبْصِرُونَ)

دکتۆر کاوە فەرەج سەعدون    پزیشکی پسپۆڕی هەناو و سنگ



پەروەردگار لە قورئانە پیرۆزەکەیدا سوێندی بەزۆر شتی گەورە وگرنگ خواردووە، وەك لە ئایەتەکانی: (لا أُقْسِمُ بِيَوْمِ القِيَامَةِ ولا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ) ، (فَلا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُوم) ، (فَلا أُقْسِمُ بِالشَّفَقِ) ، (فَلا أُقْسِمُ بِالْخُنَّسِ . الجَوَارِ الكُنَّسِ) ، (وَالسَّمَاءِ والطَّارِقِ) ، (وَالشَّمْسِ وضُحَاهَا . والْقَمَرِ إذَا تَلاهَا. والنَّهَارِ إذَا جَلاَّهَا) ، (وَالضُّحَى . واللَّيْلِ إذَا سَجَى . مَا ودَّعَكَ رَبُّكَ ومَا قَلَى)، لەبەرئەوەی پەروەردگاریش گەورە و پیرۆزە سوێند بە شتانێك ناخوات گەر گەورە و پیرۆز نەبن، ئەمە وا لە مرۆڤی موسوڵمان دەکات کە بیر بکاتەوە و تێبڕوانێت لەو شتانە و هەوڵبدات نهێنی و لایەنی گەورەییان بدۆزێتەوە، ئێمەش لەم بنەمایەوە دەمانەوێت تێڕوانینێك بۆ ئایەتە پیرۆزەکانی (فَلا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ، ومَا لا تُبْصِرُونَ) بکەین و ئیعجازی زانستیان دەربخەین و بیسەلمێنین کە ئەم راستی یە زانستیانەی قورئانی پیرۆز پێش چواردە سەدە هەواڵی پێداون لەرۆژگاری ئەمڕۆی دۆزینەوە زانستیەکاندا راستیەکانیان سەلمێنراوە.

(البصر) لە زمانی عەرەبیدا بریتیە لە (چاو) کە مرۆڤ بەهۆیەوە دەبینێت، راڤەکارانی قورئان دەربارەی ئایەتەکان بەگشتی دەڵێن: خوای پەروەردگار سوێند بە هەموو دروستکراوەکان دەخوات ئەوانەی مرۆڤ دەیانبینێت و ئەوانەشی نایانبینێت، کەواتە زۆر شت هەیە کە لە مرۆڤ شارراوەیە و نایبینێت، و زۆر شتی تریش هەیە کە ئێستا نایبینین بەڵام لەوانەیە لە داهاتوودا بیبینین هەربۆیە ووردەکاری زاراوەی قورئانمان بۆ دەردەکەوێت کە دەفەرموێت (وَمَا لا تُبْصِرُونَ) واتە ئێستا نایبینن و نەیفەرمووە (بما لن تبصرون) واتە هەرگیز نایبینن، ئەمەش بەخشندەیی پەروەردگارە بۆ مرۆڤ کە ئەو توانا عەقلیانەی پێداوە بۆ ئەوەی شتە نهێنی و نەبینراوەکانی پێ ئاشکرا بکات.

گۆی چاو کە موعجیزەیەکی پەروەردگارە کێشی تەنها ٨ گرامە، تەنها لە یەك چین لە چینەکانی تۆڕی بینین لە چاودا ٥٠٠ ملیۆن خانەی بینین ( Rods and Cons Photoreceptors) هەیە، ٨ ملیۆن خانەی (قوچەکی) تایبەت بە رووناکی بەهێز و ١٥٠ ملیۆن خانەی (چیلکەیی) تایبەت بە رووناکی کز هەن، لە چەقی چاوەوە دەماری بینین (Optic Nerve) دەردەچێت بەرەو سەنتەری بینین لە مێشکدا کە لە نیو ملیۆن ریشاڵی دەماری پێکهاتووە و رووناکی دەگەیەنێتە مێشك کە دەیکاتە وێنەیەکی بینراو، خێرایی گەیاندنی وێنەکان لە دەماری بینیندا دەگاتە ١٠٠٠ جار لە چرکەیەکدا! پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَفِي أنفُسِكُمْ أفَلاَ تُبْصِرُونَ﴾.

حیکمەتی پەروەردگار لەوەدایە کە لە کاتی رۆژ و شەودا ئەم خانانە بەسەرە کاردەکەن کە دەبێتە هۆی پاراستنیان لە فەوتان، ئەگەر تاریکایی بەردەوام بێت ئەوا چاوەکان رەشاییان بەسەردا دێت، وەك ئەوەی بەسەر کەشتیوانە ئاسمانیە یەکەمەکاندا هات (وەك: یۆری گاگارین) کاتێك چوون بۆ بۆشایی ئاسمان تەنها ئاسمانێکی رەش و تاریکیان بینی کە بە ئەستێرە دەدرەوشێتەوە، بەراستی موعجیزەیەکی گەورەیە کە پەروەردگار ئەم نهێنیەی لە ئایەتێکی تردا دەرخستووە کە دەفەرموێت: ﴿ لَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَاباً مِّنَ السَّمَاءِ فَظَلُّوا فِيهِ يَعْرُجُونَ. لَقَالُوا إنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ ﴾.

شەپۆلە کارۆموگناتیسیەکان و جیهانی بینرا و نەبینراو: کاتێك ئیسحاق نیوتن (١٦٤٢-١٧٢٧) ئاوێزەیەکی شوشەی لەرێڕەوەی گورزەیەکی رووناکیدا دانا بینی ئەم تیشکە کە رەنگی سپیە شیبووەوە بۆ ٧ رەنگ کە لە رەنگی وەنەوشەییەوە دەست پێدەکات بۆ سووری تۆخ و سەلماندی کە رەنگی سپی

سەلماندی کە ڕەنگی سپی تیشکی خۆر لەمانە پێکهاتووە، ڕووناکی بریتیە لە شێوەیەك لە شێوەکانی ووزە و بەشێکە لە شەپۆلە کارۆموگناتیسیەکان ( Electromagnetic waves) کە لە شەپۆلە گەردوونییە زۆر کورتەکانەوە دەست پێدەکات و درێژی شەپۆلەکەی وورده وورده زیاد دەکات تا دەگاتە شەپۆلە لاسیلکییە درێژەکان کە لە ڕادیۆ و تەلەفیزیۆندا بەکاردێن، چاوی مرۆڤ تەنها دەتوانێت ئەو شەپۆلانە ببینێت کە درێژییەکانیان لە ٤٠٠ نانۆمەترەوە (بریتی یە لە ١ لە ١٠٦ی میللیمەترێك) دەست پێدەکات لە ڕەنگی وەنەوشەییەوە بۆ ٧٠٠ نانۆمەتر لە ڕەنگی سووردا، چاوی مرۆڤ ناتوانێت باقی شەپۆلەکانی تر ببینێت کە لە سەروو و خوارووی ئەم لەرەوەیە وەك: تیشکی گەردوونی، تیشکی گاما و ئێکس و سەروو وەنەوشەیی و ژێر سوور و شەپۆلەکانی ڕادار و شەپۆلە ڕادیۆییەکان، کە ئەم تیشکانە بەکارهێنانەکانیان لەژیاندا زۆر زۆرە و دەتوانێن شوێنەوارەکانیان لەسەر فیلمە هەستیارەکاندا ببینین، بەتایبەتی تیشکی ژێر سوور ( Infrared rays) و گاما ( Gamma rays) و تیشکی ئێکس (X-rays) کە شەپۆلی کارۆموگناتیسی نەبینراون بەڵام چەندین بەکارهێنانی بەسوودی ڕۆژانەیان هەیە و بەهۆی کاریگەریی و شوێنەوارەکانیان لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا دڵنیابووین لە بوونیان، ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە ئەم تیشکە نەبینراوانە بەهۆی ئامێرە زانستیەکانەوە بەکاردێن بۆ وێنەگرتن و پیشاندانی ئەندامە نەبینراوەکانی ناو لەشی مرۆڤ.

تەکنەلۆجیای نوێ کە پشت بە شەپۆلە کارۆمگناتیسیەکان دەبەستێت یارمەتی داوین بۆ فراوان کردنی بازنەی بینینمان بۆ ئەو شتانەی پێشتر نەماندەبینی، زۆرێك لە زیندەوەرە ووردەکان تا دۆزینەوەی ووردبینی ڕووناکی لێمان شاراوە بوون، پاش داهێنانی ووردبین (میکرۆسکۆب) لە سەدەی حەڤدەیەمی زایینیدا مرۆڤ زۆر شتی بینی کە پێشتر نەیدەبینین لە خانەکانی بەکتریا و قەوزە و کەڕووەکان و توانی ببینێت چۆن خۆراك پەیدادەکەن و چۆن دابەش دەبن و چۆن میکرۆبەکان هێرش دەکەنە سەر خانەکانی لەشمان و چۆن خرۆکە سپیەکانمان کە پێکهێنەری سەرەکی کۆئەندامی بەرگری لەشمانن بەرەنگاریان دەبنەوە، بەهۆی میکرۆسکۆبەوە مرۆڤ سەلماندنی کە هەردوو تۆو و هێلکۆکە پێویستن بۆ دروستبوونی کۆرپەلە و سکپڕی ئەمەش پاش چەندین سەدە لە ئاماژەدانی قورئان بەم بابەتە، مرۆڤ بەچاوی خۆی بینی چۆن ئەندامەکانی لە شانەکان دروست دەبن و چۆن شانەکانی لە خانە پێکهاتوون.

پاشان ووردبینی ئەلیکترۆنی ( Electronic Microscope) داهێنرا کە بینینی مرۆڤی بردە ئاسۆیەکی نوێوە و مرۆڤ توانی پێکهێنەرەکانی خانە و ترشی بۆماوەیی (DNA) و جینەکانی بۆماوە ببینێت ﴿وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ . وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾، ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە میکرۆسکۆبی ئەلیکترۆنی ووردترین شتێك کە نایبینین کە ئەلیکترۆنە بەکاردەهێنێت بۆ پیشاندانی ووردترین پێکهاتەکانی خانەکان و کارەکانیان، لێرەشدا با ئەو پێشکەوتنە گەورەیە لەبیرنەکەین کە لە بواری دووربینە (تەلیسکۆبە) گەردوونیەکاندا بەدەستهاتووە کە وای لەمرۆڤ کردووە بتوانێت تەنە ئاسمانیە هەرە دوورەکان و ووردەکاری ئەستێرەکان و هەسارەکان ببینێت.

مرۆڤ توانی بگاتە سەر ڕووی مانگ و بەچاوی خۆی خاکەکەی بینی و توانی کەشتیە ئاسمانیەکان بنێرێت کە سەرسوڕهێنەکانی گەردوونی پیشاندابین، شتانێك کەسانی پێش ئێمە هەرگیز نەیانبینی. هەناوبینە پزیشکیەکانیش (Endoscopes) مرۆڤ توانی بەهۆیانەوە ووردترین پێکهاتەکانی ناو لەش ببینێت و شۆڕشێکی بەرپاکرد لە زوو دۆزینەوەی نەخۆشیەکاندا و ئەنجامدانی نەشتەرگەریە میکرۆسکۆبیەکان بەبێ ڕوودانی زیانی لاوەکی، توانرا هەناوبینە ووردەکان بخرێتە ناو منداڵدانەوە بۆ وێنەگرتنی قۆناغە جیاوازەکانی گەشەکردنی کۆرپەلە لەسکی دایکیدا، ئەمە یارمەتی داین کە کۆمەڵێك ڕاستی تێبگەین دەربارەی کۆرپەلەزانی کە هەرگیز پێشتر نەتوانراوە ببینرێت بەڵام قورئان پێش ١٤ سەدە زۆر بە ووردیی وەسفی کردووە، پێش ١٥ ساڵ لەمەوبەر زانا لینارت نیلسۆن (Lennart Nilsson) توانی وێنەی قۆناغە جیاوازەکانی دروستبوونی کۆرپەلە بگرێت هەر لە سەرەتای سکپڕیەوە تا لەدایکبوون کە بەهۆی ئەم کارەوە خەڵاتی نۆبلی وەرگرت.

لەو شتانەش کە پێشتر نەماندەبینی ئەو کارلێکانە بوون کە لە ماوەی هەرە کورتدا ڕوویاندەدا، وەك یەکگرتنی

گەردیلەی ماددەکان، ئەمە دەتوانین گەردیلەی ماددەکان بەهۆی بەکارهێنانی میکرۆسکۆبەوە ببینین بەڵام نەماندەتوانی کارلێکی ئەم گەردیلانە بۆ دروستکردنی گەردی نوێ ببینین تاوەکو پەروەردگار ئەم کارەشی ئاسانکرد لەسەر دەستی زانای موسوڵمان (د.أحمد زویل) کە بەهۆیەوە خەڵاتی نۆبڵی لە کیمیادا لەساڵی ١٩٩٩دا پێبەخشرا، ئەویش بە بەکارهێنانی کامیرای لەیزەری کە لەماوەیەکی هەرە کورتدا (١٠-١٥ی چرکەیەك کە پێیدەووترێت فیمتۆچرکە) وێنەدەگرێت، لەمانەی سەرەوە ئەوە تێبینی دەکەین کە پەیوەندیەکی توندوتۆڵ هەیە لەنێوان ئەو رووناکیەی کە دەیبینین و بەکارهێنانی بۆ بینینی ئەو شتانەی کە نایانبینین، بەشێوەیەك کە دوو ئایەتە پیرۆزەکەش هەمان پەیوەندی نێوان ئەم دووانەشی دەرخستووە!

شەپۆلە سەرزوو دەنگییەکانیش (شەپۆلەکانی سۆنەر (Ultrasound Waves بەکاردێن بۆ وێنەگرتنی ناولەش و بەدواداچوونی سکپڕی، لەرینەوەی موگناتیسیش (الرنین المغناگیسی) بەکاردێت بۆ وێنەگرتنی پزیشکی کە وێنەی دەستنیشانکەری سەرسوڕهێنەری شانەکانی لەش پیشاندەدات، ئەوەی تا ماوەیەکی نزیکیش نەماندەبینی و لێمان شارراوە بوو بریتییە لە قووڵایی دەریا و زەریاکان و ئەو سەرسوڕهێنەرانەی کە تێیاندایە کە بەهۆی ژێردەریایی و روناککەرەوەکان و کامێرا ووردەکان توانیمان ئەو دونیا سەمەرەیە ببینین کەمایەی سەرسوڕمان و رێزمانە ﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ﴾.

ئەوەی کەمایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە ئەو کەسانەی کە لەدایك دەبن و بێبەشن لە نیعمەتی بینین پەروەردگار هەستێکیان دەداتێ کە بەهۆیەوە بتوانن دەنگەکان بەشێوەیەك لەیەکتری جیابکەنەوە کە مرۆڤی بینەر ناتوانێت بیکات و دووریەکانیش دیاری دەکەن، کە ئەمە لەزانستی پزیشکیدا پێیدەوترێت هەستی شەشەمی مرۆڤی نابینا، کەواتە دەتوانین بڵێین ئەوانەی بینین لەدەست دەدەن بەهۆکاری تر دەتوانن ببینن بەڵام ئەوانەی کە ئیمان لەدەست دەدەن لەسەر زەوی چەندین بەڵگە دەبینن لەسەر دەسەڵاتی پەروەردگار بەڵام نایبینن بەدڵەکانیان، کەواتە ئەوەی بینایی لەدەست دەدات هیچ زەرەری نەکردووە بەڵام ئەوەی بەرچاورۆشنی نەماوە هەموو شتێکی لەدەستداوە ﴿فإنها لا تعمى الأبصار و لكن تعمى القلوب التي في الصدور﴾.

لەکۆتاییدا ئەمەی باسکراوە مشتێکە لە خەرواری ئەو بەڵگانەی کە بینیومانن و بۆی دەرخستووین بۆچی پەروەردگار سوێندی خواردووە بەوانەی دەیانبینین و ئەوانەشی نایانبینین، تاوەکو مرۆڤیش لەرووی زانستیەوە بەرەوپێش بچێت کەمی زانیاریەکانی خۆی بۆ دەردەکەوێت بەرامبەر زانیاری و دەسەڵاتی پەروەردگار، پەروەردگار زۆر جوانی فەرمووە: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَ لَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾.

رووی ئیعجازی ئایەتەکان:

١- پێشتر وادەزانرا بینین بەهۆی دەرچوونی تیشکی رووناکیەوە دەبێت کە لەچاوی مرۆڤەوە دەردەچێت، کە هەڵەی ئەم بۆچوونە بەتەواوەتی دەرکەوت کاتێك زانایان دۆزیانەوە کە بینین بەهۆی تیشکدانەوەی رووناکی لەسەر رووی تەنەکانەوە و گەیشتنی بەچاوی مرۆڤ دروستدەبێت، کەواتە بینین لەبوونی رووناکیدا دەبێت و بەهیچ شێوەیەك مرۆڤ لەتاریکیدا نابینێت، قورئانی پیرۆز ئاماژەی بە گرنگی رووناکیداوە لەبینیندا پێش ١٤٠٠ ساڵ کە دەفەرموێت: ﴿فَلا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ. وَمَا لا تُبْصِرُونَ﴾ واتە چاو هۆکاری بینین نیە چونکە چاو دەبینێت و ناشبینێت.

٢- بەدواداهاتنی شەو و رۆژ زۆر گرنگە بۆ بەردەوامبوونی بینین و بەکارهێنانی خانەکانی بینین و زانستی نوێش گرنگی خانە قوچەکی و چیلکەییەکانی بۆ دەرخستوین کە لە رۆژ و لەشەودا کاردەکەن و ئەگەر ئەم بەدوادا هاتنە نەبوایە ئەوا لەناو دەچوون.

٣- قورئانی پیرۆز سەرنجی راکێشاوین بۆ ئەو دۆزینەوە گەورانەی کە زانایان پێی گەیشتوون لە تەکنەلۆجیا نوێیەکان و هۆیەکانی بینین، هەروەها سەرنجی راکێشاوین بۆ زۆر شت کە پێشتر نەماندەبینین لەبەر ووردییان وەك: خانەی بەکتریا و قەوزە و کەڕووەکان وچۆنێتی زۆربوونیان و لەناولەشدا چۆن خڕۆکە سپیەکانی خوێن بەرەنگاریان دەبنەوە و چۆن هەردوو تۆو و هێلکۆکە گرنگن بۆ دروست بوونی کۆرپەلە.

٤-.ئایەتە پیرۆزەکە هانمان



دەدات بۆ فێربوونی زانست و بەردەوام بوون لە لێکۆڵینەوە لەهەموو بوارەکانی ژیاندا، ئەوەی دەیسەلمێنێت کە فیکری ئیسلامی فیکرێکی زانستیە داواکاری قورئانە لە مرۆڤەکان بۆ بەکارهێنانی ژیریان تا کۆتایین رادده: ﴿قُلِ انظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَوَاتِ والأَرْضِ﴾ ، ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وزَيَّنَّاهَا﴾.

٥- قورئانی پیرۆز هەواڵی پێداوین کە مرۆڤ پێکهاتەی سەرەتایی شتەکان دەدۆزێتەوە: ﴿ولَقَدعَلِمتُمُ النَّشأَةَ الْأُولَى فَلَولا تَذَكَّرُونَ﴾، لە سەدەی هەژدەیەمەوە مرۆڤ کەوتە دۆزینەوەی پێکهاتەی شتەکان، قورئانی پیرۆزیش هەواڵی پێداوین کە گەردیلە کێشی هەیە و هەروەها لە گەردیلە بچووکتریش هەیە کە کێشیان هەیە: ﴿لا يعزب عنه مثقال ذرة في السماوات ولا في الأرض ولا أصغر من ذلك ولا أكبر إلا في كتاب مبين﴾، ئەوەبوو مرۆڤ تەنها لەسەدەی نۆزدەیەمەوە تا ئەمرۆ گەردیلە و پێکهاتەکانی دۆزیەوە و بۆی دەرکەوت کە هەندێکیان کێشیان هەیە.

قورئانی پیرۆز هەواڵی پێداوین کە ئاسمانەکان و زەوی لەسەر یاسایەك دامەزراون کەناوی ناوە (حەق): ﴿خلق السماوات والأرض بالحق تعالى عما يشركون﴾، لەسەدەی حەڤدەیەمەوە تا ئەمرۆ زانست زۆرێك لەو یاسایەی دۆزیوەتەوە کە ئاسمانەکان و زەوی لەسەر دامەزراوە، و ئەمرۆ زانست بەم چوار هێزە سەرەکیەی گەردوون کورتی کردۆتەوە: هێزی کێشکردن، هێزی کارۆموگناتیسی، ناوکەهێزی بەهێز، و ناوکەهێزی لاواز، پەروەردگار سوێندی خواردووە کە لە گەردووندا شتی بینراو و نەبینراو هەیە: ﴿فَلا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ. ومَا لا تُبْصِرُونَ﴾، لەسەدەی حەڤدەیەمەوەتا ئەمرۆ زانست هێزی بینراو و نەبینراو دەدۆزێتەوە: ﴿فسبحان الله حين تمسون و حين تصبحون. و له الحمد في السموات و الأرض و عشيا و حين تظهرون﴾.

**لەم بنەمایەوە دەمانەوێت تێڕوانینێك بۆ ئایەتە پیرۆزەکانی (فَلا أُقْسِمُ بِما تبصِرونَ، وما لا تبصِرونَ) بکەین و ئیعجازی زانستیان دەربخەین و بیسەلمێنین کە ئەم راستی یە زانستیانەی قورئانی پیرۆز پێش چواردە سەدە هەواڵی پێداون لەرۆژگاری ئەمرۆی دۆزینەوە زانستیەکاندا راستیەکانیان سەلمێنراوە ..**


سەرچاوەکان:
قورئانی پیرۆز و تەفسیرەکانی.
المنجد: لويس معلوف.
خلق الإنسان بين الطب و القرآن: د.محمد علي البار.
رحلة الإيمان في جسم الإنسان: د.حامد أحمد حامد.
گۆڤاری (الإعجاز العلمي) بڵاوکراوەی (الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن و السنة).
سایتی (www.eajaz.org).

# ڕێبوارێك لەنێوان کات و کاردا

قاسم ڕەسوڵ گەلالی

ئێمەی مرۆڤ ڕێبواری ڕێگایەکی دوور و درێژین کە لە چەند وێستگەیەك پێك دێت و هەندێك لەو وێستگانەمان بڕیوەو هەندێکی ترمان لەبەردەم ماوە کە ئێمە بەرەو پیریان دەچین و ئەوانیش لێمان نزیك دەبنەوە.

خراپانە تاوەکو مردن نەهاتووەو نەڕۆیشتووین بۆ وێستگەیەك کە کاری تیا ناکرێ و هیچمان بۆ ناکرێ و هیچمان پێ ناکرێ.

دووەم//یان ئەوکات و ساتانەیە کە ئێستا لەبەردەستماندایە بۆیە پێویستە ڕێزی لێ بگرین نرخیان خۆمان بە دووبارەکردنەوەی هەڵەی ئەوانی تر بەزایە نەدەین.

سێ یەم//یان ئەوکات و ساتانەیە کە هێشتا نەهاتوون ئەویش پێویستی بە خۆئامادەکردن هەیە بیربکەینەوە ئاخۆ ئەوکاتانەی کە هێشتا نەهاتوون و دواتریش دێن لە تەمەنی خۆی ئەوەکو چی هەیە.

*مرۆڤ بەوە دەناسرێت چۆن دەژی و بۆچی دەژی ئەوەك لەکوێ دەژی و چی دەخوا .

*مرۆڤ بەوە دەناسرێت کە چەند ئامانجی گەورەی هەیەو لەکاریشدایە بۆ بەدیهێنانی




بۆیە چرکە ساتەکانی ژیانی دونیاو سەرزەویمان دەبنە سێ جۆر

یەکەم//یان ئەوەیە کە بەسەرماندا گوزەراوەو ڕۆیشتووەو بۆتە مێژوو پێویستە سودی لێ وەربگرین ئەگەر باشمان کردووە بەردەوام بین ئەگەریش خراپ ئەوا بە جورئەتەوە بڕیاری پەشیمانبوونەوە بدەین لەو بزانین وە بتوانین وەکو مرۆڤێکی پەیامدارو ئامانجداری خاوەن پلان و بەرنامە کاربکەین و لەکاتەکانماندا کاری باش ئەنجام بدەین و کارەکانمان خۆش بوێ و تا لەکاتی ئەنجامداندا چێژیان لێ وەربگرین و بەختەوەرو ئاسودەبین — تاوەکو بتوانین هەرکارێك لەکاتی خۆیدا ئەنجام بدەین و ڕێز لەکاتی خۆمان بگرین و تەمەنی و دەڕۆن و ناگەڕێتەوەو دەبنە مێژوو تەمەنی ئێمە چۆنیان بەرهەمدار بکەین چونکە دەبێ بزانین کە وێستگەیەکمان لە پێشە لەسەر هەموو کاتەکان و کارەکان لێپرسینەوەمان لەگەڵدا دەکرێ.

لەدواجاریشدا:

*مرۆڤ بەوە گەورە دەبێت و ڕێزدار دەبێت کە چی دەکات و ئامانجەکانی ئەوەك خەریکی ئامرازو وەسیلەکان بێت و ئەوانی لێ بوبێتە ئامانج و تێر نەبێ و پڕنەبێ و هەر لە خولگەی وەسیلەکاندا گێژ بخوات.

*مرۆڤ بەوە دەناسرێت کە هەست بکات شتێکی پێ یە زیادەیەکی پێ یە بیخاتە سەر ئەو ژینگەیەی کە تێیدا دەژی ئەوەك خۆی زیادبێت و ژیان و

مردن و بوون و نەبوی وەکو یەك وابێت.

*مرۆڤ بەوە گەورەیی خۆی دەسەلمێنێت لەبونی دا خەڵك هەست بە قازانجی ئەو بکەن و لە مردنی دا خەڵکی هەست بە خەسارەتی خۆیان بکەن ئەوەك بژی و بمری کەس هەست بە بون و مردنی نەکات.

بۆیە پێویستە ئێمەی مرۆڤ وەکو رێبوارێکی رێگای ژیانی کورتی دونیاو ژیانی نەبراوەی ئاخیرەت، وەکو رێبوارێك کە رێگای بەرەو مەملەکەتی ژیانی ئەبەدی و هەتاهەتاییمان گرتۆتە بەر پەند لە مێژوو رابردوو وەربگرین لەجیاتی لە مێژوودا بژین بە راستیەکانی مێژوو بژین وە بۆ ئێستامان مرۆڤی رۆژگاری خۆمان بین و بۆ داهاتووش کە دوانە ١-داهاتووی نزیکی ژیانی سەرزەوی باش خۆمان ئامادەبکەین و دیدگامان رۆشن بێت کەچی دەکەین، ٢-بۆ داهاتووی دوای مردنیش باشتر خۆمان ئامادەبکەین خەمی خۆمان بخۆین خەمی یەکتر بخۆین خەم هەڵگرین و خەمی یەکتر هەڵگرین بۆ خۆمان و بۆ یەکتر بژین چونکە لەدواجاردا لەو

**مرۆڤ بەوە گەورەیی خۆی دەسەلمێنێت لەبونی دا خەڵك هەست بە قازانجی ئەو بکەن و لە مردنی دا خەڵکی هەست بە خەسارەتی خۆیان بکەن ئەوەك بژی و بمری کەس هەست بە بون و مردنی نەکات.**

وێستگەی ژیانی سەرزەوی یەدا هەرچی بکەین بۆ خۆمانە بەڵێ ئەو مرۆڤە کە رێبواری ئەم رێگا پڕ وێستگەیە بەم چەند کورتە خاڵە دەتوانێ رێگا ببڕێ و سەرکەوتوو بێ

یەکەم-دیدی راست بۆ نەترازان لەسەر رێگای راست.

دووەم-دڵی خۆش بۆ بەختەوەری و دامەزراوی دەرونی.

سێیەم-بیری تیژ بۆ ئافراندن و کارباشی.

چوارەم-هیممەتی بەرز بۆ کاری بەردەوام و زاڵ بوون بەسەر کۆسپەکان.

لە کۆتایی دا هیوای دیدی راست و دڵی خۆش و بیری تیژو هیمەتی بەرز بۆ تۆی خوێنەر دەخوازم.



# پاکبوونەوەی ناخ، بۆچی؟

جەعفەر گوانی

لە یەکێك لە کەناڵە کوردیەکان لە زنجیرە بابەتێکدا باسمان لە پاکبوونەوەی ناخ کرد، ئەویش بە پشت بەستن بە وشە مانادارو جوانو هەلقوڵاوەکانی ناو ناخی ئیمامی غەزالی خوای لێ رازی بێت، برادەرێك پرسیاری کرد: بۆچی زۆر گرنگی بەو باسە دەدەی؟ لە وەڵامدا گووتم: لەبەر ئەوەی ئیمامی غەزالی مامۆستای پاککردنەوەی رۆحە، ئێمەش دەمانەوێت لە رێگای قسەو گوفتارە شیرینەکانی ئەوەوە قومێك لەو دەریا مەزنەدا بخۆینەوە، چونکینێ ئەوەندەی دیقەت دەدەم موسڵمانان زۆر لەو لایەنە سستو لاوازین، کاتێك دەبینین کۆمەڵە موسڵمانێك پابەندی قورئانو فەرمودە شیرینەکانی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت نابن، بێ شك خەلەلەکە لەو لایەیە، واتە ئەوان رۆحیان مردووە یان نەخۆشە، پێویستە تەکان بەو رۆحانە بدرێت تا زیندوو ببنەوەو، تامو چێژ لە نوێژی شەوانەو کڕنۆشی سەر ئەرز وەربگرن، دەبێ بزانن بۆچی کەسێك چەند دەقیقەیەك لە سوجدەدایەو، هەست بە ماندوبوون ناکات، بەڵام ئەو کێبڕکێ لەگەڵ چرکە دەکات، کەواتە هەندێ موحتاجی زیندووکردنەوەی رۆحین، هەر ئەوەندەش موحتاجی زانیارین، لەبەر ئەوەی ئەو گەنجەی (نوێژ ناکات، رۆژوو ناگرێت، ئەهلی چاکە نییە...) کێشەو گرفتی ئەو، زانیاری نییە، چونکە ئەو دەزانێت نوێژو رۆژی و عیبادەتەکانی دیکە واجبن یان سوننەتن، بەڵام لەبەر ئەوەی رۆحی مردۆوە، ناتوانێت زاڵ بێت بەسەر نەفسیو، یەکەوسەر تەسلیم بە شەیتانو نەفسی دەبێتو، کەسێکی گوناهبار دەردەچێت.

بۆیە پێویستە هەموومان

**لەگەڵ ئەو شەپۆڵەی فیتنەی گوناه و رووباری شەیتان ئەگەر خاوەن ناخێکی پاقژو خاوێن نەبین ئەوا خۆمان لە چنگ دەچێت**

گرنگیەکی زۆر بەو لایەنە بدەین، کە ئەگەر خوا پشتیوان بێت بە زنجیرە بابەتێك هەندێك خۆمان لەو باسە بەهرەمەند دەکەین، بەتایبەتی لەو سەردەمە هەر زۆر پێویستمان پێی هەیە، چونکە فیتنەو ئاشووب زۆر بووەو، بە سێنایی گەنجانو ئافرەتانو پیاوان تووشی گوناه دەبن، لەگەڵ ئەو شەپۆڵەی فیتنەی گوناهو رووباری شەیتان ئەگەر خاوەن ناخێکی پاقژو خاوێن نەبین ئەوا خۆمان لە چنگ دەچێت، بەتایبەتی کە دەبینین رۆژانە چەندان گەنج فریو دەدرێنو دەکەونە داوی شەیتانو لە رێی هاورێو برادەری خراپەوە فریو دەخۆن، دوایش پەشیمان دەبنەوە، بەڵام ئەگەر رۆحیان زیندوو بێت هەر لە بنڕا توشی ئەو سەرپێچیانە نابن، کە دوایی پەشیمانی بۆ دەردەبڕن، کە ئەگەر پەشیمانیش نەبنەوە لە ناکاو پێمان لە دنیا هەر دەزەقیو خوا حافیزی لە ژیان دەکەین، لەوێش دەبێت هەر خۆزگەی (یا لیت) بڵێینەوە.



# لە پێناو ژیانێکی هاوسەری باشترو بەختەوەر

سایە فارس

**زۆرێك لە گەنجانمان تووشی فۆبیای هاوسەرگیری بوون و ناوێرن خۆیان لە قەرەی هاوسەرگیری ء ژیانی نوێ بدەن ئەوەش بەهۆی دووبارە بوونەوەی سیناریۆی جیابوونەوە یان خیانەت یان ترسان لەبەرپرسیارێتی کە لە دەوروبەر یان خێزانەکەی کە خۆی لێی پەروەردە بووە سەرچاوەیان گرتووە !**



بێگومان هاوسەرگیری پرۆسەیەکی گرنگو پیرۆزەو بنچینەی پێکهێنانی خێزانو هەرئەویش بنچینەی پێکهێنانی کۆمەڵگەیە ئەو کۆمەڵگەیەش دەبێتە هۆی پێکهاتنی وڵاتێکی گەورەی خاوەن سنورو دەستووری تایبەت بە خۆی.

ئەمەش ڕۆڵێکی گرنگی هاوسەرگیری دەردەخات لە هێنانەدی ژیانێکی ئاوێزان لە بەختەوەری یان و کێشەو ناسۆریەکان.

ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ئەوەیە خێزانەکانمان بە ئاگا بهێنینەوە لەو ڕۆڵە گرنگەی کە پێیان بەخشراوە لە ژیاندا وە چۆنێتی بەڕێوەبردنو هەڵسو کەوتکردن چ لەنێوان هاوسەراندا یان هاوسەرانو منداڵەکانیان یاخود هاوسەرانو کەسو کارو دەورووبەرو کۆمەڵگە.

بۆیە سەرەتا پێویستە بنچینەکەمان پتەو بکەین و بنیاتی بنێین بۆ ئەوەی دووربێت لە دارمان و هەرەس هێنان، هەروەها بێهێز نەبێت لەبەرگری کردن بەرامبەر گۆڕانکاری یەکان.

زۆرێک لە گەنجانمان تووشی فۆبیای هاوسەرگیری بوون و ناوێرن خۆیان لە قەرەی هاوسەرگیری و ژیانی نوێ بدەن ئەوەش بەهۆی دووبارە بوونەوەی سیناریۆی جیابوونەوە یان خیانەت یان ترسان لەبەرپرسیارێتی کە لە دەوروبەر یان خێزانەکەی کە خۆی لێی پەروەردە بووە سەرچاوەیان گرتووە ! ئەمانەش هەموو هۆکاری وەهمین و دەتوانرێ بە ئاسانی وەلابنرێن.

بۆ ئەوەی لاوان ببنە ڕاگری کۆڵەکەی خێزانێکی سەرکەوتووو بەختەوەر پێویستە پێش وەخت ڕێنمایی بکرێن چ لە لایەن باوانەوە بێت یان مامۆستایانو کەسانی شارەزا، بۆ ئەوەی تووشی شۆک نەبن کاتێك دەبنە دەستپێکەری ئەو پرۆسە گرنگە.

کەواتە پێویستە سەرەتا بزانرێت کێ دەکاتە هاوسەری خۆی؟

ئەو هۆکارانە چین کە پێویستە لاوانمان بیگرنە بەرچاو بۆ هێنانەدی ژیانێکی هاوسەری خۆشو ئاسوودەو لێوان لێو لە ڕێزو خۆشەویستی؟

ئەمەش پێویستی بە هۆشیاری لاوان هەیە لە هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیانیان دا ئەو هۆکارە سەرکییانەش:

١- ڕەوشتی جوان

٢- ئیمانێکی پاك و ڕاستو دروستو دوور لە ڕیایی.

٣- ئاستی کۆمەڵایەتی نزیك لە یەکتر.

٤- تەمەنی گونجاوی هەردوولا.

بەڵام چەند تەوەرێکی گرنگ هەن کە زۆر پێویستە لاوان بەهەند وەریگرنو پشت گوێی نەخەن بۆ ئەوەی لە داهاتوودا تووشی شۆك نەبنو پاشانیش پەشیمانیو دواتریش کارەساتی تری بەدواوە نەبێت، ئەوانیش:

"هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی، قوربانی دان، قبوڵ کردنی کەسی بەرامبەر "

بەڕاستی هەرگیز هاوسەرگیریەکی بەختەوەر بەردەوام نابێت ئەگەر دوور بوو لەو سێ تەوەرەیە، لەبەر ئەوەی گۆڕانکاری یەکی کتوپڕ لە ژیانی هاوسەراندا ڕوودەدات، هەربۆیە پێویستە پێش وەخت لاوان ئامادە بن بۆ ئەم پرۆسەیە لە ڕووی دەروونی و جەستەیی یەوە، ئەمەش بۆ دایکان و باوان ئەگێڕمەوە بەوەی کە بەرپرسی سەرکی داهاتووی منداڵەکانو ڕۆڵیان لە ژیانی هاوسەری دا تا بتوانن بەهەشتێکی دونیایی پێك بهێنن بۆ ئەوەی بەهەشتی ئاخیرەتیشیان لە دەست نەچێت.

بە هیوای ژیانێکی ئاوێزانو لێوان لێو لە ئاسوودەییو بەختەوەری.



# لەگەڵ خوابە .. بابەختەوەربیت

ئیحسان بورهانەددین

دووركەوتنەوە لەخوای گەورە ئەشكەنجەو بەدبەختی و.. دۆزەخە

نزیك بوونیش لەخوای گەورە خۆشی و بەختەوەری و.. بەهەشتە

لەگەڵ خوای گەورە ژیان خۆش دەبێت و، دونیا سەرەڕای بچووكی و بێ بایەخی دڵگیر دەبێت.

لەگەڵ خوای گەورە مرۆڤ بەو بچووكییەی خۆی لەگوێرەی

گەردونی فراوان.. گەورە دەبێت و بەرز دەبێتەوە.

تاکو لەگەڵ خوای گەورە بیت، دڵنیابە لەوەی بە ئاسودەیی و هێمنی دەژیت و هەموو کاروبارێکت لەبار دەبێت و رۆحت بەرەو بەرزایی لە شەقەی باڵ دەدات.

تۆ کە لەگەڵ خوا بیت، کەواتە لە بەهەشتدای، بە هەموو واتایەك ئەو وشەیە هەڵبگرێت، با بێ پوول و پارەش بیت، وەکو پادشایەکی، ڕوبارەکان بەژێرتدا رێ بکەن، با خۆت باخەوانێکیش بیت.

لەگەڵ خوای گەورە دڵت پڕ لە روناکی دەبێت و، زمان و پێنووست وشەی جوانیان لێ دەردەچێت. خورپەو لێدانی دڵت بەردەوام لە هەر کوێیەك بێت هەر (الله.. الله..) دووبارە دەکاتەوە. خوا پەروەردگارمەو خۆشەویستمە و لەدڵمدا هاوەڵی نییە، درووستی کردووم و ڕۆزیم دەدات، دڵم جێگەی خۆشەویستی کەسی تری تێدا نابێتەوە.

چەند رۆژێکی خۆشە ئەو رۆژەی بە دڵ و گیانت لەگەڵ خوا بیت، لەوکاتە فرمێسکی خۆشی لە چاوەکانت هۆن هۆن دەتکێنە خوار.

الله... الله.

جوانترین ناوو سیفەتی لەخۆگرتووە. لەبەرووبوومەکانی ئەم وشە جوانە ئەوەیە بەرەوئاسمان ڕاتدەکێشێت بە شێواز و ئەندازەیەك کە لە بەرزاییەوە تەماشای دونیا بکەیت و زۆر بە بچووکی دێتە بەرچاوت و، تووشی سەرسوڕمان دەبیت لەو خەڵکەی کە کەوتونەتە نێو زەلکاوی ئارەزووەکانی نەفسیانەوە. وەکو چۆن هەڵۆیەك لەشەقەی باڵ دەدات و تەماشای چۆلەکە بچوکەکان دەکات کە سەرقاڵی چەند دەنکە گەنمێکن بەچوار دەوریاندا بڵاوبووەتەوەو، لەسەری شەڕ دەکەن. لەکاتێکدا ئەو دەنکە گەنمانە زیاتر نین لە هۆکارێك بۆ ڕاوکردنیان.

کاتێك دڵ دەدرەوشێتەوەو بەخۆشەویستی خوای گەورە ڕووناك دەبێتەوە، هەموو شتەکانی بەڕوونی بۆ دەردەکەون و، ئیتر فریو ناخوات بە کەس و بەزمانی لووس و بروانامەی زل ناخەڵەتێ.

ئەو موسڵمانەی کە دڵی بە خۆشەویستی خوا پڕ بووەو، پەرۆشە بۆ ڕۆژی دوایی و.. لەم دونیایەو هەرچیشی کە تێدایە گەورەتر دەبێت.

**بەزەییت بەخۆتدا بێتەوە پێش ئەوەی پەنجەی پەشیمانی بگەزیت.. بە تێروتەسەلیش لەم واتایانە بیر بکەرەوە، ئینجا قۆڵی لێ هەڵماڵە بۆ گەشتەکەت.. لەگەڵ پەروەردگارت بژی بۆ ئەوەی هەست بە خۆشی و کامەرانی ئەم دونیایە بکەیت، پەنا بە خوا بگرەو هەرگیز بێ ئومێد مەبە ..**




ئیتر چۆن سوکایەتی بەخۆی دەکات و لەگەڵ گێژەلووکەی ئاژاوەدا دەڕوات، لەڕاستیدا بێ ئاگایی لەم واتا مەزنانە وامان لێ دەکات ڕاستیە گەورەکان فەرامۆش بکەین و ڕێگە بۆ شەیتان خۆش بکەین لە خشتەمان ببات.. ئایا نابینین پاسەوانی بێستان ئەگەر بێستانەکەی پشتگوێ بخات و کەمتەرخەمیی تێدا بکات بەرووبومی باخەکەی دەبنە دەستکەوتێکی ئاسان بۆ دز و چەتەکان.

تۆیش بە هەمان شێوە ئەی ئادەمیزاد، لەوکاتەی لە پاسەوانێتی دڵت غافڵ دەبیت و بایەخی پێ نادەیت، ڕێگە بۆ شەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکەکان خۆش دەکەیت کە بە ئارەزووی خۆیان یاریت پێ بکەن.

بەزەیت بەخۆتدا بێتەوە پێش ئەوەی پەنجەی پەشیمانی بگەزیت.. بە تێروتەسەلیش لەم واتایانە بیر بکەرەوە، ئینجا قۆڵی لێ هەڵماڵە بۆ گەشتەکەت.. لەگەڵ پەروەردگارت بژی بۆ ئەوەی هەست بە خۆشی و کامەرانی ئەم دونیایە بکەیت، پەنا بە خوا بگرەو هەرگیز بێ ئومێد مەبە... خوای گەورەش باشترین پشت و پەنایە.

# بەرەو بەختەوەری

**ئەندازیار عوسمان**

موسڵمان بوونی قازی بەریتانی مارلین مۆرێنکتن:
حەمزە یوسف بانگخوازی بەناوبانگی ئەمریکی لەچاو پێکەوتنێکدا لەگەڵ (مارلین مۆرێنکتن) دا وتی: ئێستا ئێمە لە بەریتانیا چاومان دەکەوێت بە قازی مارلین مۆرێنکتن، سەرەتا بەخێرهاتنی دەکەین، بەرێزتان کەپاش هەوڵ و ماندووبوون و ئەزمونی زۆر گەیشتوونەتە ئەم پلە بەرزە کە قازی (مقاگعە) یەکن و، چەند قازی تریش لەژێر دەستی بەرێزتان کاردەکەن، پێمانخۆشە باسی بەسەر هاتی مۆسڵمانبونی خۆتمان بۆ بکەیت.
مارلین: من نزیکەی دەساڵ لەمەوبەرە کاردەکەم بۆ بەرگری کردن لە توندو تیژی و تاوان بەرامبەر ئافرەتان، بە حوکمی کارەکەم وەك قازییەك، لە زۆر کارو پرۆژەدا بۆ ئەومەبەستە بەشداریم کردووە، بەتایبەتی لەناوجالیەی ئیسلامیی ئەم ولاتە.
بۆئەوەی لەپاشخانی رۆشنبیری و فیکریان تێ بگەم کەوتمە دیراسەی قورئان و تێکەڵاویم بۆ دروست بوو لەگەڵ مسوڵمانانداو ئەمتوانی دوورە پەرێز بم، خوای گەورە چاودێری و هاریکاری کردم، هەر لە سەرەتاوە کەسانێکم بینی رێنماییان کردم بۆ رێگەیەك کە ناتوانم لێ ی بگەرێمەوە.
چەند زیاتر شارەزابم لە ئیسلام و لە پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) بۆم دەردەکەوێت و زیاتر دڵنیا دەبم کە ئەم ئیسلامە جێ ی منەو هەقە من سەربە مەبم و ئەم پەیامە ئارامیم دەداتێ.
کاتێك چیرۆکی ژنەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی دەبیستم، بەتایبەت وتارە پەڕاوو کاسێتەکانی تۆ هەست دەکەم ئەمە بۆمن دەگونجێت.
لەبواری کارەکەمدا بۆم دەرکەوت کە مسوڵمانان هەندێ جار شوێن عادەت و تەقالید دەکەون نەك پەیامی خوا، بۆیە شوکردنی ناچاریی و زۆرە ملی هەیە لەناو جالیەی ئیسلامیدا، کە بەزۆری خێزان دەبێت ئافرەتێك شوو بکات بە خاڵۆزاو ئامۆزای، زۆر جار بۆئەوەی رایان کێشن بۆ بەریتانیا و ئیقامەو رەگەزنامەیان دەست بکەوێت، ئەمەش کێشە و گرفتی ئابووری و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی دەنێتەوە.
جالیەی پاکستانی سەردانم کردوون هەژاران، کە دێنە ئێرە کێشەی جیاوازی کەلتورو رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی وادەکات لاوەکانیان پەنا بەرنە بەر تاوان و ماددە هۆشبەرەکان.
-حەمزە یوسف: کە چوویت بۆ پاکستان و سعوودیە ئەزموونی ئەو ولاتان چۆنە بەلاتەوە؟
پاکسان هەژارە و خەڵکەکەی کە دێنە ئێرە کێشەی خۆیان هەیە بەهۆی عادات و تەقالیدیانەوە کەتێکەڵ بەدینیان کردووە، لەم دواییەدا لەتورکیا بووم بۆکاری فەرمی، دیارە ئەزموونەکان جیاوازن لەیەکتری.. پێش چەند



هەفتەیەك لە ولاّتی سعودیە هاتمەوە، ئافرەتان رۆڵی بەرچاویان هەیە لە كۆمەڵگاداو، ئافرەتانیان لەبواری پەروەدەو فێركردن و تەندروستی دا كاردەكەن و هەندێ ئافرەتیشیان لەبواری بازرگانیدا سەركەوتوون و هەندێكی تریان لەبواری خێرخوازی دا ئیشی باشیان نەكردووە.

ئێستا لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا لە هەوڵدایین تاوەكو شاندێكی ئافرەتانی سعودیە بێنە ئێرە و بەیەكەوە بەرنامەدابنێین بۆ بنەبڕكردنی توندو تیژی بەرامبەر ئافرەتان.

سەردانی دادگای شەرعیم كردو قازییەكانیانم بینی، كۆمەڵێ پزیشكیشم بینی هەموو لە هەوڵی ئەوەدان بەیاسا رووبەڕووی توندوتیژی بەرامبەر منداڵ و ئافرەتان ببنەوە.

-حەمزە یوسف: موسڵمان بوونت بەلای دەورو بەرتەوە چۆن بوو؟

مارلین: ئەمەم بەقورس نەگرتووەو زۆر گوێی پێنادەم، یەكێ لەقازی یەكانی دادگای باڵا هەرگیز باسی ئاینەكەی نەكردووە، خەڵكی بەڕەوشت و خوی دا دەزانن كە كەسێكی مەسیحی چاكە، منیش دەمەوێ لە رێ ی هەڵس و كەوتمەوە بناسرێم وەك مسوڵمانێكی باش.

-حەمزە یوسف: تۆ بەرپرسی موقاتەعەیەكیت، چۆن دەڕوانی بۆ توندو تیژی لای موسڵمانان؟

هەرچەندئامارمان لانیە، بەڵام لەئەنجامی كاركردنەوە بۆم دەركەوتووە، كە توندوتیژی لای موسڵمانان زۆرترنیە لەباقی كۆمەڵگە، هەرچەند موسڵمان دووچاری ڕەگەزپەرستی دەبن و دژایەتی دەكرێن و كێشەی زمانیان هەیەو ئاسانكارییان بۆناكرێت.

لەم ماوەیەدا قسەم كرد لەگەڵ ئافرەتێكی موسڵمانی چالاكدا كەناوی (شاهین تاج)ە، هاوڕابووین لەبارەی پێویست دامەزراندنی كۆمەڵەیەك لەسەرئاستی ولاّت بۆ ئافرەتان، كە ببێتە پەناگەو پاڵپشت بۆ ئافرەتان لە كاتێكدا كە تووشی توندوتیژی دەبنەوە.. من كە لە سعودیە هاتمەوە بەجل و بەرگی پاڵاپۆشیەوە بە داخەوە پیاوێك بەخراپی ڕووبەڕووم بووەو، وتی: خۆت لادە دووركەرەوە.

زۆر سەیرە خەڵكی بەگشتی بەنەرمی و ئاسكی مامەڵە دەكەن لەگەل ڕاهیباتدا كە ئەوانیش وەك ئێمە داپۆشراون، كەچی بەرامبەر ئافرەتی موسڵمانی داپۆشراو هەڵسوكەوتیان وەك پێویست نیە، ئەمەش دیارە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وێنەیەی كە لەبیرو هۆشیاندا دروست بووە لەبارەی موسڵمانانەوە و ئیسلام بەهەڕەشەو مەترسی دەزانن بۆسەریان.

-حەمزە یوسف: كە تۆ دیراسەی شەریعەت دەكەیت پێچەوانەنایەتەوە لەگەڵ كارەكەتدا وەك قازی یەك ؟

مارلین: نەخێر چونكە لێكچوونێك هەیە لەنێوان یاساكانی ئیسلام و یاساكانی ئێمەدا.

-حەمزە یوسف: هەرچەند ئێمە هەموو بە ئیسلام بەهێز دەبین، بەڵام هاتنی عومەری كوڕی خەتتاب رەزاو رەحمەتی خوای لێبێت بۆ ئیسلام، ئیسلام و مۆسلمانان بەهێزبوون، هیوادارم كە هاتنی قازی( مارلین مۆرینگتن) بەرەو ئیسلام ببێتە هۆی زیاتر بلاّوبوونەوەی ئیسلام و بەهێزی ئیسلام و مسولمانان لەبەریتانیا و جیهاندا.

مارلین: منیش هیوادارام وەك قوتابیەكت بتوانم پاداشتی لەسەدایەكی چاكەكانت بدەمەوەو بتوانم خزمەت بە ئیسلام بكەم.

**چەند زیاتر شارەزابم لە ئیسلام و لە پێغەمبەرەكەی ( صلى الله عليه وسلم ) بۆم دەردەكەوێت و زیاتر دڵنیا دەبم كە ئەم ئیسلامە جێ ی منەو هەقە من سەربەمەبم و ئەم پەیامە ئارامیم دەداتێ.. كاتێك چیرۆكی ژنەكانی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) و هاوەڵانی دەبیستم، بەتایبەت وتارە پەڕاوو كاسێتەكانی تۆ هەست دەكەم ئەمە بۆمن دەگونجێت .**

# گەنج و زانکۆ و خۆشەویستی و خوێندن ..

یوسف ئەحمەد کوردی *

هەروەك لە ناوی ئەم شوێنە بەدەر دەکەوێت کە زانکۆ شوێنی کۆبونەوەی زانستەکانە، زانکۆ واتە کۆکەرەوەی زانستەکان.
هەروەها پەیمانگە شوێنی پەیماندان و پەیمانبەستنە دیاریشە کە ئەم پەیماندان و پەیمانبەستنەش هەر لەرووی زانستەوەیە واتە ئەو شوێنەیە کە قوتابی و خوێندکاران تێیدا پەیمان دەدەن کە ئەو زانست و زانیاریانەی وەریانگرتوە و فێری بووینە بە ئەمانەت و بە تەواوی جێبەجێی بکەن و بیپارێزن و بیگەیەنن بە نەوەی تر کە لە قوتابخانەکان چاوەڕێیان دەکەن.
ئەمە پەیامی سەرەکی زانکۆ و پەیمانگاکانە کە پێویستە قوتابی و خوێندکارە خۆشەویستەکانمان لەبیریان بێت و پشتگوێی نەکەن.
ئەگەر لەگەڵ پاراستنی ئەم پەیام و ئەرکە دوو قوتابی (کچێك و کوڕێك) یەکتریان بە دڵبوو و بە راستیش نیازیان پاك بوو لەگەڵ یەکتر و بەتەمای هاوسەرگیری بوون و سنووری خوداشیان پاراست، ئەوە بە رای من نابێتە نادروستی و نابەجێیی ئەگەر یەکتریان خۆشبوێت، بەڵام بە داخەوە ئەوەی تێبینی دەکرێت بەدەگمەن رێکدەکەوێت کە کوڕێك و کچێك ئاوا رێك بکەون، بە پێچەوانەوە زۆرجار ئەم جۆرە پەیوەندیە بوویتە مایەی بەدواکەوتنی ئەو کەسانە لە خوێندن و لەدەستدانی پەیامی زانکۆ و پەیمانگە و تەنانەت جاری وابووە گەیشتوەتە حاڵەتی شەڕ و کوشتنی یەکێکیان یان هەردوکیان، بۆیە وای بەباش دەبینم کە قوتابیان لەو ماوەی کە لە خوێندنن ئەوا خەریکی خوێندن بن و بەس، باشتر وایە دوای دەرچوون بیر لە هەڵبژاردنی هاوسەری ژیان بکرێتەوە.

هەروەك پێشتر ئاماژەم پێدا و دوبارەشی دەکەمەوە و دەڵێم کە بە دڵنیایەوە دیاردەی کات بەسەربردن یاخود خۆشەویست بازی لەناو ناوەندەکانی خوێندندا کاریگەری سلبی زۆری دەبێت لەسەر هەردوو رەگەز و لەسەر نێوەندی خوێندنەکە و هەروەها ئایندەی ئەوانیش و ئایندەی وڵاتیش. چونکە هەروەك ئەزانین بە پێی زانستەکانی گەشەپێدانی مرۆیی و لە دەرەنجامی سەدەها لێکۆڵینەوە و تاقیکردنەوە ئەوە سەلمێندراوە کەوا مرۆڤ کاتێك بەرهەمی باشتر و چاکتر دەبێت و خوێندن و وەرگرتنی زانیاری باشترو وردتر و کاریگەرتر دەبێت کە قوتابی و خوێندکاران تەرکیزیان زۆرترو زیاتر لەسەر خوێندنیان بێت.
بەلام کاتێك شتی تر دێتە رێگەی وەرگرتنی زانیاریەکان ئەوا تەرکیزیان پەرش و بلاو دەبێت و لە دەرەنجامدا کاریگەری نێگەتیڤی دەبێت لەسەر شێوازی وەرگرتنی زانست و زانیاریەکان بە شێوەیەکی راست و دروست ئەمە وا دەکات کەوا ئاستی زانستی و زیرەکی قوتابیان دابەزێت و بە باشی سوود لە زانیاریەکان وەرنەگرن، هەربۆیەش دەبینین کەوا ئاست و نمرەی ئەو قوتابخانانەی کەوا یەك رەگەزین واتە تەنها کوڕانن یان تەنها کچانن زۆر باشتر و بەرزترە لەو قوتابخانانەی کەوا تێکەڵن، هەر بۆیەش ئێستا لە ئەمریکا و بەریتانیا و یابان و زۆرێك لە وڵاتانی ئەوروپی گرنگی دەدەن بە خوێندن و کردنەوەی قوتابخانەی یەك رەگەزی.
بەرای من جێبەجێکردن و راپەراندن و گەیاندنی ئەرك و پەیامی زانکۆ و پەیمانگاکان و



هەروەها باشتر کردن و بەرزترکردن و پەرەپێدانی زانست و زانیاری لەو نێوەندانەدا بەس تەنها ئەرکی قوتابی نیە بەلکو ئەم ئەرکە دابەش دەبێت لەسەر چەند کەس ولایەنێك هەر یەکەو بە رێژەیەکی جیاواز و بەم جۆرەی خوارەوە:
قوتابیان و خوێندکاران: ئەوان یەکەم کەس و ئاخیر کەسن لە سوودمەند بوون و زەرەرمەندبوون لە پرۆسەی پەروەردە و فێرکردندا، بە مانای ئەوەی خۆشی و ناخۆشی، خۆشبەختی و بەدبەختی، براوە و دۆڕاو بە پلەی یەك ئەوانن چونکە کاریگەری دەبێت لەسەر ژیانی داهاتویان. بۆیە زۆر گرنگە کە قوتابیانمان

دەرك بەم ئەركە گەورە و پیرۆزە بكەن كە لەسەر شانیاندایە و هەوڵی جددی بدەن كە ببنە پاڵەوانی ئازای ئەو مەیدان و گۆڕەپانە و خەریكی ئەسڵی ئەرك و وەزیفە و پەیامی خۆیان بن وەك قوتابی و خوێندكار.

مامۆستایان و پسپۆڕان: ئەوانیش بێگومان بێبەش نین لە هەڵگرتنی ئەم ئەركە پیرۆزە و گەیاندنی ئەم پەیامە پیرۆزە، بەڵكو ئەگەر ئەركی ئەوان لە ئەركی قوتابیان زیاتر نەبێت ئەوە هەرگیز كەمتر نییە. مامۆستا یەكەم رەگەز و كۆڵەكەی پرۆسەی پەروەردە و فێركردن و تێگەیاندن و پێگەیاندنی قوتابیان و خوێندكارانن چونكە ئەمانە نەوەی داهاتون و ئایندەی خاك و وڵاتیش بەوانەوە بەستراوە، بۆیە

**بەڵام سەد حەیف و مخابن جاروبار لێرە و لەوێ شت دەبیستین و شت دەخوێنینەوە كە چەند مامۆستایەكی زانكۆ لەبری پەروەردە كردن و فێركردنی قوتابیان ئەو بەخۆی خەریكی دڵداری و حەزحەزانێیە لەگەڵ قوتابیانی خۆی**

پێویست دەكات مامۆستایانمان زۆر بە بایەخەوە و بە هەستێكی زۆر بەرزی بەرپرسیاریەوە ئەركیان جێبەجێبكەن.

بەڵام سەد حەیف و مخابن جاروبار لێرە و لەوێ شت دەبیستین و شت دەخوێنینەوە كە چەند مامۆستایەكی زانكۆ لەبری پەروەردە كردن و فێركردنی قوتابیان ئەو بەخۆی خەریكی دڵداری و حەزحەزانێیە لەگەڵ قوتابیانی خۆی تەنانەت جاری وا بووە گەیشتۆتە ئاستی دەستدرێژكردنی سێكسی **(التحرش الجنسي)**، هەڵبەتە ئەو جۆرە كەسانە زۆر كەم و بێ ئەرزشن و ژمارەشیان ناگاتە پەنجەكانی یەك دەستیش، كە پێویست دەكات هەڵوێستی زۆر توند بەرامبەر ئەو كەسانە وەربگیرێت وسزای توندیش بدرێن.

لە بەرامبەر ئەوانەش سوپاس بۆ خوا پەروەرشیار و مامۆستای زانكۆی زۆر بەڕێز و گەورە و بە ئەرزش و وەفادار و زیرەك و بەتوانا هەن كە جێگەی شانازین و پێویستە سوپاس بكرێن و پاداشت بدرێنەوە لەسەر بە چاك راپەراندنی ئەركەكەیان.

سیستەم و پرۆگرامی خوێندن: هەڵبەتە دیارە سیستەم و پرۆگرامی خوێندنیش بایەخەكەی كەمتر نییە چونكە وەك ئەو خۆراكە وایە كە دەدرێتە منداڵ بۆ پێگەیاندن و گەشەكردنی جەستەولاشەی بە شێوەیەكی راست و دروست و تەندروست. ئەوەی هەموولایەك دەیزانین ئەوەیە كە ئەو دامودەزگایانەی سەرپەرشتی ناوەندەكانی خوێندن دەكەن هەر لە دایەنگەكانەوە بیگرە تا زانكۆ و پەیمانگەكان خەریكی پرۆسەیەكی زۆر بە بایەخ و بە بەها و چارەنوس ساز و گرنگن كە ئەویش پرۆسەی (پەروەردە و فێركردن)ە، كە دیارە ئەم پرۆسەیە لە دوو بەشی زۆر گرنگ و جیاواز پێكدێت (پەروەردە) و (فێركردن) كە ئەگەر چی جیاوازن بەڵام زۆر تەواوكاری یەكترن و هیچ كامیان بێ ئەویتر رۆڵی راستەقینەی خۆی نابینێت.

بەڵام بەداخەوە ئەو دوو پرۆسە گرنگە بە تایبەتی پرۆسەی یەكەمیان كە (پەروەردە)یە یان تەواو فەرامۆش كراوە یان ئەگەر هەشبێت ئەوە شتێكی وا نییە كاریگەری هەبێت لەسەر كەسایەتی قوتابی بە شێوەیەك بتوانێت وا لە قوتابی بكات خاڵە سلبیەكان و خووە ناپەسەندەكان و رەفتارە نادروستەكانی كەسایەتی خۆی بگۆڕێت بە هی جوان و باش و پەسند. بۆیە پێویستە زۆر بەجددی كە سیستەم و پرۆگرامی خوێندنمان پێش هەموو شتێك سیستەم و پرۆگرامی پەروەردەكردن بێت ئینجا فێركردن.

دامودەزگا بەرپرسەكان: هەر لە بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەكانەوە تا بە راگرایەتی كۆلێژەكانەوە دەڕوات و تا دەگاتە سەرۆكاتی زانكۆ و وەزارەتی پەروەردە و فێركردن و وەزارەتی خوێندنی باڵا و تەنانەت ئەنجومەنی وەزیرانیش دەگرێتەوە، كە بەرپرسن لە دانان و بەڕێوەبردن و جێبەجێكردنی پلان و سیستەم و پرۆگرام و میكانیزم و ئالیەتی پەروەردە و فێركردنی رۆڵەكانمان و قوتابیە ئازیزەكانمان، بە جۆرێك كە وا لە قوتابی بكات خەریكی خۆپێگەیاندن بێت و ئەركی خۆی وەك قوتابیەك تێدا بكات و پەیامی قوتابیەتی لەدەست نەدات و خەریكی شتی لاوەكی نەبێت.

لە كۆتاییدا دڵنیام زۆر پێویستە پلانێكی ستراتیژی (پەروەردە و فێركردن) هەبێت كە تێیدا رۆڵ و ئەركی تەواوكاری هەر یەك لە قوتابی و مامۆستا و سیستەم و بەرپرسان روون و ئاشكرا بێت و هەموولایەكیش بەیەكەوە هەنگاو بنێن بەرەو ئامانجێكی دیاریكراو و رۆشن.

*مامۆستا و راهێنەر لە گەشەپێدانی مرۆیی



# دەردەکانی خەمۆکیی

هێمن عەبدولعەزیز

کاتێ کە ئینسان کەسێکی لێ ون دەبێت، یا شتێکی لێ ون دەبێت، یان شتێکی لێ ڕوو ئەدات، یا لە شتێك بێزار دەبێت، ئاشکرایە کە ئەو ئینسانە دووچاری خەمۆکی و دڵتەنگی دەبێت... هەر ئەم جۆرە حاڵەتەشە کە ئینسان بەرەو خەمۆکی ئەبات.

بۆیە دەبێ بزانین کە ئەم ژیانە بەردەوام لە یەك حاڵدا نامێنێتەوە، بگرە گۆڕاناکارییەکان یەکێکە لە سیماکانی ژیان. بۆیە لەگەڵ درێژەی ژیان کەسەکان لە نێوان دڵخۆشبوون و دڵتەنگی و خەمۆکییەوە ژیان دەبەنە سەر. وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

**وَنَبْلُوكُمْ بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ (الأنبياء: ٣٥)**

واتە: وە ئێمە تاقیتان دەکەینەوە بە خراپەو ناخۆشی وە بە چاکەو خۆشی تا دەردەکەوێ (چاك و خراپ) وە هەر بۆ لای ئێمە دەگەڕێنەوە. بۆیە ئەمە دونیایە گەر جارێك تیایدا پێبکەنیت دەیانجار تیایدا دەگریت. کەوابوو کە ژیان وابوو، بە تەئکید ئینسانیش وەك بوونەوەرێکی تەنگەتاو و لاواز ئەبێت بەشی لە خەمەکانی ژیان بەر بکەوێت. بەڵام چونکە خوا ئیرادەو هێزێکی ناوەکی بە بەندەکان داوە، ئەوە بە تەئکید کاتێ کە بەندەیەك بکەوێتە نێو ڕەحەتییەکەوە ئەوە زۆر ئاسان

دەتوانێت خۆی لە خەمەکان ببوێرێت و قوتار بکات و تەسلیم بە خەمۆکییەوە نەبێت.

دیارە کە دڵخۆشی و خەمیش دووشتی خوار سکین کە لە ئینساندا ڕسکاون، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: **وَأَنَّهُ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَى (النجم:٤٣ )** واتە: وە بێگومان هەر ئەویش بەندەکان دەخاتە گریان و پێکەنین.

عەکریمە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: هیچ کەس نییە کە دڵخۆش نەبێ و دڵتەنگیش نەبێت. کەوابوو لەگەڵ خۆشییەکان شوکرانەبژێرو لەگەڵ خەمەکانیش بە نارامبە.

بۆیە نکوڵی ناکرێت کەوا بەندەکان قەت دووچاری خەمۆکی نایەن ئەگەر هۆکاری خەمۆکییەکان لە ئارادا نەبن. بەڵام ئەوەی کە شتێکی خراپە ئەوەیە کە ئەو کەسە خۆی تەسلیم بە خەمەکانەوە بکات، تا وای لێ بێت دەستەوسان و لە خۆی خۆش بێ و خۆی لە هەموو کەس بە دوور بگرێ و لە گۆشەیەکا گۆشە گیر بێت. تا جاری وا هەیە ئینسانەکان هەندە خەمبارو نارەحەت دەبن تا دەگات بە ئاستی خۆکوشتن!! (خوا بمانپارێزێت).

بۆیە دەبینین کەوا پێغەمبەری خوا (**صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم**) هەمیشە لە خوای ویستووە فەرموویەتی: «**اللهم إني أعوذ بك من الهم والحزن**» (البخاری ومسلم) واتە: خودایە! من پەنا بۆ تۆ دەبەم لە ئەندێشەو لە دڵتەنگی.

چونکە هەر موسیبەتێك کە دێتە پێش ئینسان بە تەئکید بۆی دەبێتە کەفارەت بۆی بەو مەرجە ئەو ئینسانە قەناعەت و بڕوای پتەوو شوکرانە بژێر بێت پێی، وەك پێغەمبەر (**صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم**)دەفەرموێت: «**مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ وَلاَ وَصَبٍ وَلاَ هَمٍ وَلاَ حَزَنٍ وَلاَ أَذًى وَلاَ غَمٍ ، حَتَّى الشَّوْكَةُ يُشَاكُهَا إِلاَّ كَفَّرَ اللَّه بِهَا مِنْ خَطَايَاه**» ( **البخاري ومسلم عَنْ أَبِي سَعِيدٍ وأَبِي هُرَيْرَة رضي اللَّه عَنْهُمَا** ) واتە: هەر مسوڵمانێك دووچاری ماندوو بوون و نەخۆشی و شپرزەیی و دڵتەنگی و ئازارو خەم بێتەوە، هەتا دڕکێکی پێوە گیر بێت، (ئەوا) خوا بۆی دەکات بە کەفارەت بۆ تاوانەکانی.

## هۆیەکانی خەمۆکی:

زۆر هۆکار هەن بۆ درووست بوون و هەرقوڵینی خەم لە دڵی بەندەکان، لەوانە:

جاری وا هەیە کە ئەو کەسە لە دونیا شتێکی لە دەست چووە، ڕەنگە بە سەبەب نەخۆشییەکەوەیە کە لێی پەیا بووە، یان کەسێکی خۆشەویستی لە کیس چووە، یان دوژمنانی بەسەری دا زاڵ بوونە، یان گاڵتەیەکی پێ کراوە.

بۆیە لە هەموو حاڵەتەکانەوە ئەوەیە کە ئەو کەسە تەسلیم بە خەمۆکییەوە نەبێت، چونکە خوا دەفەرموێت: **وَلا تَهِنُوا وَلا تَحْزَنُوا وَأَنْتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ (آل عمران:١٣٩)**

واتە: سست و دڵ لاواز مەبن وە غەمبار مەبن هەر ئێوە بەرزو بڵندترن ئەگەر بڕوادار بن.

دەبینین کەوا پێغەمبەر (**صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم**) خەمبار بوو بە هۆکار وەپیرەونەچوونی بێباوەڕان و گاڵتە پێکردنیان پێی، کەچی خوا ئاگاداری دەکاتەوە کە خۆی نەداتە دەست ئەم ئاخ و خەمەوە، فەرمووی:

**قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لا يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ (الأنعام:٣٣)** ﴾ واتە: بەڕاستی ئێمە دەزانین کە بێگومان ئەوەی کە ئەوان دەیڵێن غەمبارت دەکات بەڵام بێگومان ئەوان تۆ بەدرۆزن دانانێن بەڵکو ئەو ستەم کارانە ئایەتەکانی خوا ئینکار دەکەن.

یان فەرمووی: **فَلا يَحْزُنْكَ قَوْلُهُمْ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ (يس:٧٦)** واتە: جا قسەکانیان غەمبارت نەکات چونکە بەڕاستی ئەوەی دەیشارنەوەو ئەوەی ئاشکرای دەکەن ئێمە دەیزانین.

هەروەها فەرمووی: **وَلا يَحْزُنْكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لَنْ يَضُرُّوا اللَّهَ شَيْئاً يُرِيدُ اللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظّاً فِي الْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ (آل عمران:١٧٦)** واتە: با دڵ غەمگینت نەکەن ئەوانەی پێشبڕکێ و پەلە دەکەن لە بێ بڕواییدا بێگومان ئەوانە هەرگیز هیچ زیانێك ناگەیەنن بە خوا ، خوا دەیەوێت کە هیچ بەشێکیان بۆ دانەنێ لە ڕۆژی

**حاڵەتەکانی خەمۆکی کە ڕوو بەڕووی ئینسانەکان دەبێتەوە، لە کەسێك بۆ کەسێك بە پێی تواناو عەزیمەتی ئەو کەسە دەگۆڕێت، نیشانەکانیشی بریتین لە: سینە تەنگی، زوو هەڵچوون و تووڕەبوون، زۆر بیرکردنەوە، کەمی متمانە بە خۆبوون، قسەکانی بێسەروبەرو پەشۆکاو دەبێت، هێندێکیش هەن کەوا ئیعتیزال دەکەن و خۆ لە خەڵکی وە دوور دەگرن ..**

دوایی دا وە بۆ ئەوان سزایەکی گەورە هەیە. یاخود فەرمووی: **يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ لا يَحْزُنْكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ مِنَ الَّذِينَ قَالُوا آمَنَّا بِأَفْوَاهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِنْ قُلُوبُهُمْ وَمِنَ الَّذِينَ هَادُوا سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّاعُونَ لِقَوْمٍ آخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ مِنْ بَعْدِ مَوَاضِعِهِ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَذَا فَخُذُوهُ وَإِنْ لَمْ تُؤْتَوْهُ فَاحْذَرُوا وَمَنْ يُرِدِ اللَّهُ فِتْنَتَهُ فَلَنْ تَمْلِكَ لَهُ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً أُولَئِكَ الَّذِينَ لَمْ يُرِدِ اللَّهُ أَنْ يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ (المائدة:٤١)** . واتە: ئەی پێغەمبەر -**صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم**- با غەمبارت نەکات ئەوانەی کە بەپەلە بەدەم بێ باوەڕی و بێ دینیەوە دەچن، لەوانەی کە بەدەم و زار دەڵێن: باوەڕمان هێناوە، بەڵام دڵیان باوەڕی نەهێناوە، هەروەها لەوانەش کە بوونەتە جولەکە و زۆر گوێگرن بۆ درۆو دەلەسە، زۆر گوێبیستن بۆ خەلکی تریش (کە خوانەناسن و) نەهاتوون بۆ لات، قسە دەگۆڕن و قسە وەکو خۆی ناگێڕنەوە، یاخود ناوەڕووی دەکەن، دوای ئەوەی جێی خۆی گرتبوو (ئەوانەی کە خەڵك دەنێرن بۆ لای پێغەمبەرو پێی) دەڵێن: ئەگەر ئاوا بڕیاریدا لێی وەربگرن، ئەگەر وانەبوو هوشیار بن، جا ئەوەی خوای گەورە بیەوێت تووشی تاقیکردنەوە و سزای بکات، ئەوە هەرگیز تۆ خاوەنی هیچ شتێك نابیت لەلایەن خواوە بۆ رزگار بوونی ئەو، ئائەوانە ئەو کەسانەن خوا نەیویستووە دڵیان پاك و خاوێن بکاتەوە (چونکە خۆشیان مەبەستیان نەبووە) ئەوانە لە دنیادا سەرشۆڕیی و شەرمەزاریی بەشیانە، لە قیامەتیشدا سزای سەخت و گەورە چاوەڕێیانە.

بۆیە پێغەمبەری خوا (**صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم**) لە هەموو کەس زیاتر لە هەوڵی هیدایەتدانی خەلکەکە بوو، لە هەمووشیان زیاتر خوای دەناسی، هەر بۆیە نارەحەت دەبوو کاتێك کە خەلکەکە پەرچیان پێ ئەداو بە گوێیان نەدەکرد. لێیان ئەداو سوکایەتیان پێی دەکرد. وەخواش هەواڵی پێ دابوو کە ئەگەر بیەوێت وا ئەکات کە هەموو خەلکی سەر زەوی ئیمانی پێ بهێنن. وك فەرمووی: **وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَنْ فِي الْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعاً أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ (يونس:٩٩)** واتە: وە ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە بڕوای دەهێنا ئەو (خەلکەی) وا لە زەوی دا هەموو تێکڕا دەی ئایا تۆ (ئەی موحەمەد -**صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم**) زۆر لە خەلکی دەکەیت هەتا ببنە بڕوادار.

کەواتە: هەر شەیتانە کە خەم دەخاتە دڵی بڕواداران:

خوا دەفەرمویێت: **إِنَّمَا النَّجْوَى مِنَ الشَّيْطَانِ لِيَحْزُنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَيْسَ بِضَارِّهِمْ شَيْئاً إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ** ﴿ واتە: بێگومان چپە لە شەیتانەوەیە و بەس تا ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە دڵتەنگ بکات لە کاتێکدا کە هەرچی زیان بێ پێیان ناگەیەنێت مەگەر بە فەرمانی خوا ئیماندارانیش بە تەنها پشت بەخوا ببەستن. چونکە شەیتان ئیستغلالی زۆر شت ئەکات تا دوژمنایەتی و نارەحەتی لە نێو دڵی بڕواداران درووست بکات بۆ ئەوەی دووچاری خەمیان بکات.

بۆیە پێغەمبەر (**صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم**) هەر زوو ئاگاداری کردووینەتەوە کەوا تەسلیم بە شەیتان نەبین نەکا نارەحەتین بخاتە دڵەوە، لەوانە دەفەرموێت: «**إذا كُنْتُمْ ثلاثة، فَلا يَتَنَاجى اثْنَانِ دُونَ الآخَرِ حتَّى تَخْتَلِطُوا بالنَّاسِ ، مِنْ أجْل أنَّ ذلكَ يُحزِنُهُ » متفقٌ عليه ".( مسلم عن ابنِ مسْعُودٍ رضي اللّه عنهُ)** واتە: ئەگەر سێ کەس بوون، با دوویان بەبێ سێیەمیان چپە نەکەن، تا ئەو کاتەی تێکەڵ بە خەلکەکە دەبنەوە، لە پێناو ئەوە نەکا (سێیەمیان) خەمی پێوە بخوات.

هەتا دەبینین کەوا پێغەمبەری خوا (**صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم**) لە پێناو تەسلیم نەبوونمان بە خەم چەندین جۆر خەونی بۆ دەستنیشان کردووین لەوانە دەفەرموێت: «**رؤيا تحزين من الشيطان» ( البخاري ومسلم)** واتە: خەونی (خراپ) خەمهێنانە لای شەیتان.

**حاڵەتەکانی خەمۆکی کە ڕوو بەڕووی ئینسانەکان دەبێتەوە، لە کەسێك بۆ کەسێك بە پێی تواناو عەزیمەتی ئەو کەسە دەگۆڕێت، نیشانەکانیشی بریتین لە: سینە تەنگی، زوو هەڵچوون و تووڕەبوون، زۆر بیرکردنەوە، کەمی متمانە بە خۆبوون، قسەکانی بێسەروبەرو پەشۆکاو دەبێت ..**

نیشانەکانی خەمناکی:

حاڵەتەکانی خەمۆکی کە ڕوو بەڕووی ئینسانەکان دەبێتەوە، لە کەسێك بۆ کەسێك بە پێی تواناو عەزیمەتی ئەو کەسە دەگۆڕێت، نیشانەکانیشی بریتین لە: سینە تەنگی، زوو هەڵچوون و تووڕەبوون، زۆر بیرکردنەوە، کەمی متمانە بە خۆبوون، قسەکانی بێسەروبەرو پەشۆکاو دەبێت، هێندێکیش هەن کەوا ئیعتیزال دەکەن و خۆ لە خەلکی وە دوور دەگرن، هەست بە بێهێزی و شکان دەکەن، هێندێ

جاران دووچاری دەردی شێتی و هاریش دەبن و هەوڵ دەدەن زوو تۆڵەو ئینتیقام بکەنەوە..

لە ڕووی لاشەییشەوە:

دووچاری دەردی (بێتاقەتبوون و تەمەڵی و هەستکردن بە ئازاری لاشەو سەریەشەو کەمخۆری و خەوزڕان و هەستکردن بە گەرمایەتیی لەش و..هتد) دەبنەوە.

زیانەکانی:

زۆرێك لە زانایان ودەروونناسان کۆمەڵێ زیانیان لە کەسانی خەمۆکی دەستنیشان کردووە لەوانە دکتۆر (سلیم الهیپم) دەڵێت: لە زیانەکانی خەمۆکی بریتییە لە:

١. خاوبوونەوەی زیهن لاوازبوونی تەرکیز.

٢. بێهیممەتبوون و هەمیشە هەست بە بێدەسلاتی دەکەیت.

٣. هەستکردن بە تێکشکان و خاوبوونەوەی بەدەنی، وە هەستکردن بە ئازار لە هەموو لاشە، بە تایبەت ژانە سەر.

٤. بەندایەتییەکانی بە گورجی بۆ ئەنجام نادرێت.

٥. پشتکردن لە کارە گرنگەکان بۆ هۆکار بیرکردنەوەی بەردەوام.

٦. گومانبردنی خراپ بە خەڵك، بەڵکوو هەندێ جار گومان بەرەو یەقینی دەبات لەبەردەم خەڵکەکە.!

٧. دووچاری ڕەشبینیت دەکات.

ئەگەر ئەم خەمۆکییەشی بەردەوام بوو ئەوە دووچاری ئەمانەی خوارەوە دەبێت:

١. مێشکی لە کاردەکەوێت، کە سەرەنجام دووچاری نەخۆشی زەهایمەر دەبێت، کەوا لە ئینسان دەکات تووشی بیرچوونەوە ببێت.

٢. زووپیر دەبێت، ئەوەیش لەبەر بێتاقەتییەکی زۆر کە لە لاشەیدا بە هۆی خەمۆکییەوە پەیا دەبێت.

٣. دووچاربوونی هەندی نەخۆشی درێژخایەنی ترسناك، وەك لە کارکەوتنی پەنکریاس و برینداربوونی گەدەو نەخۆشی گورچیلە... هتد

٤. زووتووڕەبوون و هەڵچوون بەهەر شتێك بێت، لە دواییا هەڵسوکەوتی زۆر بێمانەو دەبەنگانە ئەنجام دەدات.

٥. قەڵەقبوون و مێشك گەرمبوون، لە دواییا تووشی دڵەڕاوکەو کەنابەی دەکات.

چارەسەری:

١. هەوڵدان بۆ زیادکردنی ئیمان، هەرچەند ئیمان بەهێز بێت، ئەو کەسە زیاتر بڕوای پتەو دەبێ و خۆی تەسلیم بە قەدەری خوا دەکات، دەزانێت، کەوا ئەو شتە ناگاتە بەندەو تووشی نابێ هەر لە ئەزەلدا نەنووسراوە کە بۆی ببێ ، وە ئەو شتەی بۆ ئەبێ‌و، ئەیگاتێ هەر لە ئەزەلدا نەنووسراوە: کە بۆی نەبێ. خۆ ئەگەر ئەو کەسە شوکرابژێری کرد لە سەر نیعمەت و ئارامی گرت لە سەر موسیبەت ئەوە بۆ ئەو باشترە.

٢. زۆر یادی خواکردن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: **الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ** **(الرعد:٢٨)** واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و دڵیان ئارام دەبێت بەیادی خوا ئاگادار بن کە هەر بە یادی خوا دڵەکان ئارام دەبن.

٣. خۆدوورگرتن لەوانەی کە هۆکاری تووڕەبوونن، هەوڵ بدە کە ڕەوشتەکانت جوان بکەو دڵت فراوان بکەو نەفست پێبگەیەنە، تا خراپەکان لە خۆت دووربخەیتەوە، چاوپۆشی بکەو ڕەوشتی جوان لە خۆتدا پەیا بکە.

لە کۆتاییدا قسەیەکی شێخ عایزلقەڕنی دەهێنمەوە کە لە کتێبی (لا تحزن)دا دەڵێت: خەم مەخۆ: چونکە تۆ دوێنێ خەمۆکیت تەجرووبەکردو هیچی لێ شین نەبوو و کەلکی پێ نەگەیاندی.

خەم مەخۆ: چونکە تۆ خەمت لە موسیبەتێك خوارد، لە دواییا موسیبەکەت لێ بوو بە مەساییب، لە هەژاریتا خەمت خوارد، زیاتر هەژاری کردی.

لە قسەی دوژمنانت خەمت خوارد، زیاتر ناڕەحەتیان کردیت، خەمت لە شتێکی خراپ خوارد کەچی ئەم خراپە نەهاتە دی.

خەم مەخۆ: چونکە بە خەم خانووی گەورەت دەست نەکەوت.. ئافرەتی جوانت دەست نەکەوت.. ماڵ و سامانی زۆرت دەست نەکەوت.. دەسەڵاتت دەست نەکەوت.. منداڵی زۆرت پێنەدرا.

خەم مەخۆ: چونکە خەمخواردن ئاوی شیرینت لێ تاڵ ئەکات، گوڵت بۆ ئەکات بە بڕکە گوژاڵك، باخچەت لێ ئەکات بە بیابان، ژیانت لێ ئەکات بە زیندان.

خەم مەخۆ: چونکە تۆ دوو چاوت هەیە، دوو گوێت هەیە، دوو لێوو دوو دەست و دوو قاچ و زمانێکت هەیە، ئەمن و ئەمان و لەشساغیت هەیە فبأی والآو ربکما تکذبان جا بە کام نیعمەتانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

خەم مەخۆ: چونکە تۆ دینێکت هەیە باوەڕدار بیت پێی، ماڵێکت هەیە تێی نیشتە جێ ببیت، نانێکت هەیە کە بیخۆیت، ئاوێکت هەیە کە بیخۆیتەوە، جلێکت هەیە کە بیپۆشیت، ژنێکت یا مێردێکت هەیە لەگەڵی تەسکین ببیت.. کەواتە خەم لە چی دەخۆی؟!!

سەرچاوە

١. ئیسلام ویب

٢. لا تحزن (شێخ عائیز ئەلقەرنی)

# گەنجان لە نێوان بەدیهێنانی خەونی خۆیان و خەونی ئەوانی تردا

محەممەد حەسەن عەبدوڵڵا

لەسەرەتای دروست بوونی مرۆڤایەتی و هاتنە دونیای ئێمەی مرۆڤ و دەست پێکردنی ژیانمان لەم سەر زەوییەدا بیروبۆچوون و باوەڕی مرۆڤەکان جیاواز بوون و لەو ساتانەوە جیاوازییەکان هەبوون و بە ڕۆژگارەکانی مێژوودا درێژبوونەتەوە و گەشتوونەتە ئەمڕۆ کە بێ گومان پاش ئەمڕۆش هەر بەردەوام دەبن.

گەنجان یەکێکن لەو توێژانەی کە کۆمەڵگاکان زیندوویی خۆیان بە گەنجانەوە دەپارێزن، هەندێك جار گەنجان دەبنە مایەی سەرکەوتنی کۆمەڵگاکان و هەندێك جاریش بە پێچەوانەوە دەبنە مایەی شکست، بەڵام ئایا بۆچی سەرکەوتن و بۆچیش شکست؟

دەبێت لەپێشدا ئەوە بزانین کە ئایا ئەو داواکاری و خەونانەی کە گەنجان هەیانە لە کۆمەڵگادا هاتوونەتە دی؟ چونکە گەنج سەرەتای تێگەشتنیەتی لە ژیان و لەوێوە دەرگای چوونە ناو ژیانی بە تەواوی بەسەردا دەکرێتەوە و بۆیە لەم ساتەوە داواکاری و خەونەکانی دەست پێدەکەن و ئیتر وردە وردە دەیەوێت بۆی جێبەجێ بکرێت.

لە بەرامبەریشدا کۆمەڵگا کۆمەڵێك داواکاریی و خەونی هەیە بۆ گەنجان کە خوازیاری جێبەجێ کردنیانە، بۆیە دەبێت هەردوولا بە باشی لەیەك تێبگەن،چونکە باش لەیەك تێگەشتنیان مەرجە بۆ هاتنە دی خەون و داواکاریی هەریەکەیان.

ئەوەی ئەمڕۆ هەستی پێدەکەین جۆرە ململانێیەکی ناشەریفانەیە لە نێوان هەندێك لە گەنجان و چەند توێژێك لە توێژەکانی تری کۆمەڵگا،چونکە جوان لە داواکاری یەکتر تێنگەشتوون و نازانن ئەرك و مافیان چییە لە کۆمەڵگەدا کە ئەمەش بۆ خۆی دەبێتە مەسەلەیەکی تر، هەندێك لە گەنجان پێیان وایە کە جیهان و ژیانی مرۆڤایەتی بە جۆرێك پێشکەوتووە کە ئەوەی دوێنێ و لە ڕابردوودا بەکارهاتووە دەبێت بە یەکجاری کۆبکرێتەوە و لا ببرێت و ئیدی ئەوانە بە کەڵکی ئەمڕۆ نایەن، لە لایەکی تریشەوە هەندێك لە چین و توێژەکانی تری کۆمەڵگاش بە پێچەوانەی ئەو گەنجانەوە پێیان وایە کە نابێت شوێن ئەو پێشکەوتنانە هەمووی بکەوین و باوەڕیان وایە کە زۆرێك لەوانە" پێشکەوتن نین و تەمبەڵ کردن و کوشتنی مرۆڤەکانە" وەك خۆیان دەڵێن،هەرچەند لە نێوان ئەم دوو بیرکردنەوەیدا بیرکردنەوەی تریش هەیە بەڵام ئەم دوو بیرکردنەوەیە بوونەتە دروستکەری کێشە و جۆرێك لە لێك دووری لە نێوان خۆیاندا بۆیە دەبێت کار بۆ لێك نزیك کردنەوەیان بکرێت، دەبێت ئەو گەنجانە بزانن کە تەنها خەونەکانی ئەوان شەرت نییە و شتی تریش هەیە، هەروەها بەرامبەرەکانیشیان بزانن کە پێشکەوتنەکان بەو جۆرەش خراپ و زیانبەخش نین کە ئەوان ناسیویانن و دەبێت مرۆڤ حەکیمانە بەکاریان بهێنێت.



دەبێت هەموومان ئەو ڕاستیە بزانین کە ژیان هەرگیز بە تەواوی بە ویستی ئێمە ناڕوات بەڕێوە و شەرت نیە ئەوەی ئێمەی دەیڵێین و خەونی پێوە دەبینین تەواو ڕاست بێت، لەناو بیرکردنەوە و خەونی ئەوانی تریشدا ڕاستی زۆر هەیە کە لەوانەیە ئێمە هەستمان پێیان نەکردبێت، بۆیە بیرکردنەوەی ورد پێویستە بۆ هەموومان تاوەکو لە ژیان و ماناکانی بە جوانی و وەك خۆی تێبگەین.

چیرۆك و بەسەرهات

# هیوا لەناو کارەساتەوە

مامۆستا حەسەن پێنجوێنی



یەکێك لەوشتانەی پاداشتیان لای خوا گەورەیە، ئارامی و خۆگرییە لەکاتی بەڵاو نەخوشیدا.. پێم خۆشە روونکردنەوەیەك لەو بارەوە بنووسم پێش ئەوەی بەڵگەکان باس بکەم..و بڕۆینە ناو چیرۆکەکەوە..

کافر و موسوڵمان باوەڕدار و بێ باوەڕ هەردوو تووشی بەڵاو ناخۆشی دەبن، هەردوویان هەوڵ دەدەن بۆ رزگاربوون لەو بەڵاو ناخۆشییەی تووشیان هاتووە .. ئەدی گەر چارەسەر نەدۆزرایەوە؟.. ئەگەر بەڵاکە نەڕۆیشت و کۆتایی نەهات؟ ئەگەر نەخۆشییەکە نەخۆشی شێرپەنجەو لەو جۆرانە بوو کە تا ئێستاش چارەسەری نەدۆزراوەتەوە؟ ئالێرەدا دەوری باوڕ و بێ باوەڕی دیاری دەدات.. ئەوەی کە بێ باوەڕە چ شتێك هەیە ئەو بەڵاو نەخۆشی و ناخۆشییەی لەسەر سووك بکات؟ چی هەیە خۆی پێ دڵخۆش بکات؟!

بەڵام ئیماندارەکە پێی دەگوترێ: قورئان مژدەت دەداتێ کە ئەوانەی خۆگرن و لەکاتی لێقەومانا نارِوخێن و ورە بەرنادەن پاداشتیان لای خوا بەبێ حسابە، هەروەك خوا خوی دەفەرموێ:

" إِنَّمَا يُوَفَّي الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ" هەروەها پێغەمەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ ئەوانەی هیچ بەڵایەکیان تووش نەبوە و لەشساغبوون، کاتێ ئەو پاداشتە گەورەیەی نەخۆش و موسیبەتداران دەبینن ئاوات دەخوازن کە لەدنیادا بە مقەست گۆشتیان لێ بکرایەتەوە، تا ئێستا ئەو پاداشتە گەورەیان دەست بکەوتایە.. هەروەك لە فەرموودەیەکی دروستا ترمزی ریوایەتی دەکات کە پێغەمەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: " يَوَدُّ أَهْلُ الْعَافِيَةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حِينَ يُعْطَي أَهْلُ الْبَلَاءِ الثَّوَابَ لَوْ أَنَّ جُلُودَهُمْ كَانَتْ قُرِضَتْ فِي الدُّنْيَا بِالْمَقَارِيضِ". أخرجه الترمذي ، وقال : هذا حديث غريب، قال ميرك: وإسناده جيد، والحديث حسن . سنن الترمذي : كتاب الزهد عن رسول الله صلي الله عليه وسلم / باب ما جاو في ذهاب البصر.

هەروەها لەفەرمودەیەکی ترا فەرموویەتی: " إِذَا ابْتَلَي اللَّهُ الْعَبْدَ الْمُسْلِمَ بِبَلَاءٍ فِي جَسَدِهِ قَالَ اللَّهُ : اكْتُبْ لَهُ صَالِحَ عَمَلِهِ الَّذِي كَانَ يَعْمَلُهُ ، فَإِنْ شَفَاهُ غَسَلَهُ وَطَهَّرَهُ ، وَإِنْ قَبَضَهُ غَفَرَ لَهُ وَرَحِمَهُ . " أخرجه أحمد من حديث أنس مرفوعا، كماقاله ابن حجر في فتح الباري، واتە: ئەگەر خوای باڵادەست لاشەی موسوڵمانیکی تووشی بەڵا و

نەخۆشی کرد، خوا بەفریشتەکانی دەفەرموێ: کردەوە چاکەکەی بۆ بنووسن.. جانەگەر چاکی کردەوە ئەو نەخۆشییەی بۆ دەکاتە شۆردن و پاکردنەوەی لە گوناه.. ئەگەر بردییەوە بۆلای خۆیشی لێی خۆش دەبێ و رەحمی پێ دەکات.. **ونظيره في صحيح البخاري: " سِمِعْتُ أَبَا مُوسَي مِرَارًا يَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّي اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا مَرِضَ الْعَبْدُ أَوْ سَافَرَ كُتِبَ لَهُ مِثْلُ مَا كَانَ يَعْمَلُ مُقِيمًا صَحِيحًا" صحيح البخاري: كتاب الجهاد /باب يكتب للمسافر ما كان يعمل في الإقامة.** واتە: ئەبو بوردە فەرمووی: من چەندان جار لە ئەبوموسام بیستوە کە پێغەمەر **صلى الله عليه وسلم** فەرموویەتی: ئەگەر بەندەی موسوڵمان نەخۆش کەوت یا سەفەری کرد کاتێ نیشتەجێ و لەش ساغ بووەوە چ عیبادەتێکی کردووە خوا ئەوەی بۆ ئەنووسێ.


**پارێزەرەکەم کەوتە وتووێژ لەتەك خاوەن کومپانیاکەدا،وئەوانیش خەرجی چارەسەرییەکانیان گرتە ئەستۆ، و هەروەها بڕێکی زۆرپارەیان پێدام، وەك قەرەبووی زیانە جوستەییەکانم! بەو پارەیە کۆمەڵە بەشێکم لە بەشەکانی کومپانیاکە کڕی، پاشان ناچاربووم دابنیشم و ئەو بۆشاییەم بە خوێندنەوە پڕ بکەمەوە .. و دیتم دەتوانم خوێندنی زانکۆم تەواو بکەم ..**


هیوا لەناو کارەساتەوە:

دەماودەمی بەیانی بوو هەوا زۆر ساردبوو، بۆئەوەی هەندێ لەشی گەرم بێتەوە، چالاکی دەنواند و بەسەر پەیژەکاندا سەردەکەوت و دەهاتە خوار، لەکۆتاییدا خۆی لەپەنای کۆمەڵێ کرێکارا بینییەوە کە خەریکی بارکردنی بەفرگر(**ثلاجة**)ە شووشەکان بوون بۆ یەکێ لە کۆگا گەورەکانی شار، و بەتایبەت ئەم کارگەیەش ئەم کاری تیا دەکرد تایبەتمەند بو بەدروستکردنی ئەو جۆرە بەفرەچاڵانە، کەبۆ پارێزگاریکردن لە گۆشت بەکار دەهێنران..

ماوەیکی زۆر لەتەك ئەوکرێکارانەدا مایەوە، لەتەنشت ئەو مەکینە گەورەیەوە کە بەفرەچاڵەکانی بەرز دەکردەوەو لەناو لۆرییە گەورەکانا دای دەنا، کرێکارەکانیش یارمەتی بەرزکەرەوەکەیان دەدا بۆ رێك کردنی بەفرەچاڵەکان لەناو لۆرییەکەدا.. ئەمیش کە رۆیشتبووە ئەو نزیکانەوە لەناکاوێکا دوابەدوا گەڕایەوە لەترسی ئەوەی نەوەك ئەو بەفرەچاڵە زلە بکەوێتە خوارەوە کەهێشتا بەتەواوی خۆی نەگرتبوو، ئەو بەستەزمانە ناکاو پێی هەڵەکەوت و بەفرەچاڵ کەوت بەسەر پشتیا، و لەهەمان کاتا پارچە شووشەیەکی زەبەلاحی ٥٠٠ کیلۆیی خزاو کەوت بەسەر هەردوو لاقیدا!!

کاتێ هاوکارەکانی رایان کرد بۆ ئەوەی فریای بکەون، دییان خوێنێکی زۆری بە خووڕ لێ دێت، هەموو هاریکارییان کرد بۆ ئەوەی پلێتی شووشەکە لەسەر لاقی لابەرن، فریاگوزارییان بۆداواکرد و بە زووترین کات گەیەندیانە نەخۆشخانە، و پزیشکەکان لەسەری کۆبوونەوە،و دییان شکاوییەکی زۆری هەیەو هەندێ شوێنی بەتەواوی ورد بووە، و وەك دەڵێن: بووە بەتریت، خوێن بەربوونی هەندێ شوێنیشی زۆر ترسناکە، بۆیە جگە لە بڕینەوەی هەردوو لاقی پزیشکەکان چارەیەکی تریان بۆ نەدۆزرایەوە. چونکە گانگرین بەهەردوولاقیا سەرکەوتبوو، ئیتر لێردەوە گەشتی کوێرەوەری دەستی پێکرد.. ئەکم پیاوە بەهێزە بەتوانایە، ببوە پارچە گۆشتێکی بێکار..!لو دەبێ کورسییەك هەڵی بگرێت، ئاڵ و گوێزی پێ بکات..

دوانزە ساڵ بەسەر ئەم حاڵەدا تێپەڕی لەکۆڕێکا لەتەك برادەرەکەیا دانیشتبوو لێی پرسی: ئەوکاتەی ئەم رووداوە رووی دا هەست و ئیحساست چۆن بوو؟!

ئەویش پێی گوت: لەوکاتەدا زۆر خەمبار وبەپەرۆش بووم، لەڕووداوەکە تووڕەبووم، لەهەموو دەورو بەرم تووڕەبووم، حەزم دەکرد تۆڵە لەدەوروبەرم بکەمەوە!! پارێزەرێکم گرت و ئەو پێی گوتم: تۆ بەڵگەی بەهێزت هەیە بۆ ئەوەی بتوانی مافی خۆت بەدەست بێنی و کومپانیاکە ناچار بکەیت زیانەکانت بۆ بژێرت..

ئینجا پارێزەرەکەم کەوتە وتووێژ لەتەك خاوەن کومپانیاکەدا،وئەوانیش خەرجی چارەسەرییەکانیان گرتە ئەستۆ، و هەروەها بڕێکی زۆرپارەیان پێدام، وەك قەرەبووی زیانە جوستەییەکانم! بەو پارەیە کۆمەڵە بەشێکم لە بەشەکانی کومپانیاکە کڕی، پاشان ناچاربووم دابنیشم و ئەو بۆشاییەم بە خوێندنەوە پڕ بکەمەوە.. و دیتم دەتوانم خوێندنی زانکۆم تەواو بکەم، پاش چوار ساڵ و نیو لە بڕینەوەی هەردوو لاقم خوێندنی تەکنیکی زانیارییەکانم لەزانکۆدا تەواو کرد، ئەمە وای لێکردم زیاتر بایەخ بە کار و باری ئەوکومپانیایە بدەم، کە چەند بەشێکم تیا هەیە.. لەوم بەدواا

چوون و خیبرە پەیدا کردنەدا توانیم ڕێگا چارەیەك بدۆزمەوە بۆ بەرهەم زیادکردنی کومپانیاکەو زۆربوونی قازانجی.. لەگەڵ ئەوەدا هیچ کام لە ئەندامانی بەرێزەبەری کومپانیاکە بایەخیان پێ نەدام.. منیش داوایەکم لەدژیان تۆمار کرد.. و ناچاربوون لەمەولا گوێ بۆ راو بۆچوونەکانم بگرن.. بەو مەرجە ئەگەر بۆچوونەکانم شکستیان هێنا من لەبەشەکانی خۆم بۆیان ببژێرم!!

منیش هەوڵمدا وسەرەنجامیش پێچەوانەی ئەوەبوو کەئەوان چاوڕوانی بوون، بیرۆکەکەم سەرکەوت، و بەشێوەیەکی کارا جێبەجێکرا، و قازانج و سوودم دووبەرابەر بووەوە، وتوانیم کۆمەڵە بەشێکی تر لە بەشەکانی کومپانیاکە بکڕم، و لە دەزگای بەڕێوەبەرایەتیدا چەند پلەیەکم بڕی و ئێستا دەبینی جێگری بەڕێوەبەری گشتی کومپانیاکەم..

لە کۆتاییدا:

لەسەرەتاوە ئەم پیاوە پێی وابوو ڕووداوەکە لێقەومانێکی گەورە و کارەساتێکی ناهەموارە، بەلام ئەو کارەساتە -وەك خۆی گوتی- هاندەری بوو بۆئەوەی چاوێ بەهەموو فەلسەفەی ژیانیا بخشێنێتەوە، تا ببێتە سەرەتای هیوایەك بۆ رزگاركردنی ژیانی خۆی و خێزانەکەی..

بەڵێ، ئەوکارەساتە ژیانی ئەوی کردە ژیانێکی پڕ دەستکەوت، و راستی و دروستی یاسا خواییەکەیش نمایان بوو - جا خەلکی باوەڕیان پێی هەبێ یان نا - کە دەفەرموێ: " **فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا** " النساو/١٩. لەوانەیە ئێوە شتێکتان پێ ناخۆش بێ بەلام خوا خێرێکی زۆری تیا داناوە.. لەپاش هەموو تەنگژەیەکی ژیانەوە ئینسان پێویستی بەوە هەیە ئەم پرسیارە لەخۆی بکات: " ئەوەی رووی دا چ حیکمەتێکی تیابوو؟ " لەوانەیە لەناو کارەساتەکەدا حیکمەتەکەی بۆدەربکەوێت، لەوانەشە پاش کات وزەمانێکی کورت یادرێژ حیکمەت وسوودەکەی بۆ دەربکەوێت، بەلام ئەو یاسایە بەردەوام دەمێنێتەوە کە: لەگەڵ هەموو کارەساتێکا هیوایەك هەیە..ولەگەڵ هەموو ناخۆشییەکدا خۆشییەك هەیە.." **إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا** " .

پەخشانە شیعر ..

## میحرابی دڵ

دڵم گریا گوتی: بەبێ خورپەی عەشقت زەمەنە رۆیی
ئەشکم ڕژا گوتی: بەبێ دەمی ویساڵ تەمەن رۆیی
چرای دڵم بێ نووری تۆ، خۆ تاریکی لە بن نایە
کەوتووی دەرگەی ئەوینی تۆم، هەر نووزەییێك لە من نایە
یا حەبیبی، دەستی دڵم بگرە هەتا میوانتبم
تەنها ڕۆحێ شك دەبەم من، بەلام سەد جار قوربانتبم
تەسبیحی من دەنکی ئەشکە، دنیام لە نێو دڵ دەردەکات
ڕوو لە یادت، ناوت لە نێو باغی دەمم، گوڵ دەردەکات
ئەی ئەستێرەی نێو ئاسمانی بێ تریفەو بێ ڕۆشناییم
تۆ ئەی مانگی تاقانەی دڵ، تاکە چرای ڕێی کۆتاییم
دەستی ڕۆحم لەم میحرابە ڕاخستووە بۆ ئەم یادە
چاو پڕ ئەشك، دڵ پڕ عەشق، دەستم لە نێو دەستی وادە
تەبیبی ڕۆح، ڕۆحی شەیدا، من هەڵوەدا و حەیرانتبم
حەبیبی دڵ، دڵەی تەنیام، دەبێ ڕۆژێ میوانتبم
بە خودا قەسەم، گیانی دڵم، من عاشقی نووری رووتم
بێ تەوافی شەنگی یادت، مەحبووبەی دڵ بە خودا ڕووتم
هەتا هەوەڵ ڕۆژی ئەنوار، من بە فیداو قوربانتبم
خودا لوتفێ پەخشان بکات، من لەو دنیا جیرانتبم
تۆ ئەی چەتری بێ نەوایان، دڵنەوایی هەموو دەمم
ئەگەر مایێت هەناسەیەك، ناوی تۆیە لە نێو دەمم
بە پێ خاوسی، دەست لەسەر دڵ، ڕێگەی عەشقی تۆم گرتووە
من خاکی تۆم بە دڕکەوە لەسەر سەرم هەڵگرتووە



عەبدولوەهاب شوانی

# گرنگترین ئەندامی جەستەی مرۆڤ چی یە؟

و. بەدەستکاری یەوە: فاتمە ئەدهەم - خورماڵ



منداڵ بووم رۆژێکیان دایکم لێی پرسیم دەزانی گرنگترین ئەندامی جەستەی مرۆڤ چی یە؟ بە درێژایی رۆژ و مانگ و ساڵ وەڵامێکی زۆرم دایەوە بەڵام هیچ لەم وەڵامانەی من وەڵامی راستی پرسیارەکەی دایکم نەبوو، جارێکیان بیرم کردەوە کە (دەنگ) کاریگەری گرنگی هەیە لە ژیانی مرۆڤدا، بۆیە بەدایکم وت (گوێ)یە واتە گرنگترین ئەندامە، بەڵام لە وەڵامدا وتی: نەخێر، لەبەر ئەوەی زۆرێک لەخەڵکی کەڕن کەچی ماون و درێژە بەژیانیان دەدەن. وتی: باشتر بیربکەوە بە زوویی وەڵامی ئەم پرسیارەتم لێت دەوێ.

دیسان ماوەیەکی زۆر تێپەڕی دووبارە دایکم داوای وەڵامی لێ دەکردم، بۆیە ئەمجارە پێموت (چاو) لەبەر ئەوە ئەندامێکە هەموو کەس پێویستی پێیەتی، بۆیە گرنگترین ئەندامی جەستەی ئادەمیزادە سەیرێکی کردم و وتی: نەخێر ئەم وەڵامەشت هەڵەیە، چونکە کەسانی کوێریش لە دەوروبەرمانن و دەژین گرفتێکی ئەوتۆشیان نی یە.

بۆیە ئەمجارە بە تەواوی سەرم لێ تێکچوو و وازم نەهێنا بەردەوام بە دوای وەڵامی ئەم پرسیارەدا بووم و نەمدەتوانی بێ وەڵام بەجێی بهێڵم حەزم دەکرد بیزانم، بۆیە هەرجار دەمپرسی دایکم دەیوت (وەک هەموو جاری) نەخێر!

پاش ماوەیەک باوکم کۆچی دوایی کرد بە جارێک هەموومانی خەمبار کرد و کەلێنێکی گەورەی لەژیانمان بەجێهێشتن، رووداوی نەمانی باوکم لەناومانندا پرسیارەکەی دایکمی لەبیر بردمەوە، بۆیە رۆژێک سەری خستە سەر شانم بە هێمنی فرمێسکی دەڕشت، لەم کاتەدا پرسیارەکەی بەبیرهێنامەوە منیش بێ وەڵام بووم وتم : ئێستا گرنگترین ئەندامی لاشەی مرۆڤ چی یە؟ وتی ئێستا کاتی ئەوە هاتوە وەڵامی ئەو پرسیارەت دەسکەوێت ئەویش گرنگترین ئەندام (شانە)کانە. بە سەرسوڕمانەوە وتم: چۆن؟ شانەی مرۆڤ! ئەی چ گرنگی یەکی هەیە، ئایا لەبەر ئەوەیە سەری مرۆڤیان هەڵگرتووە. وتی: (نەخێر بەڵکو کاتێک دۆستێک یان خۆشەویستێک دەگری سەری دەخاتە سەر شانی کەسێکی تر و پێی دەحەوێتەوە)، هیوادارم کەسێک هەبێت شانەکانی دانەوێنێ بۆت تاسوکنابیت بۆ بێت.. ئێستا تێگەیشتم کە گرنگترین ئەندامی جەستەی مرۆڤ چی یە، چونکە سودێکی بۆ کەسەکەیە و سودێکیشی بۆ بەرامبەرەکەی دەبێت .

وەرگیراوە لە گۆڤاری (خانوادەسبز).

# ئایا دەتەوێت منداڵەكەت بەبێ پێوتن نوێژ بكات؟




خوشكێك دەگێڕێتەوە و دەڵێت: بەسەرهاتی خۆمتان بۆ دەگێڕمەوە لەگەڵ كچەكەما.. كچەكەم لە پۆلی پێنجی سەرەتاییدابوو، زۆر نوێژەكانی بەلاوە قورس بوو، تەنانەت رۆژێكیان كە پێم گوت هەستە نوێژەكەت بكە، بەرماڵەكەی هەڵگرت و رۆیشتە ژوورەكەی تر و لەوێ بەرماڵەكەی فڕێدایە سەر زەوی ودانیشت بێ ئەوەی نوێژەەی بكات، ئیتر نەیزانی كەمن چاودێری دەكەم بزانم چیدەكات و چی ناكات؟ كە هاتەوە لێم پرسی: كچم نوێژەكەت كرد؟ گوتی: بەڵێ..زۆر بەو درۆیەی پەست بووم - هەر چەند من خۆم بە هەڵە دەزانم و دان بەهەڵەكەی خۆما دەنێم- ئەوەند تووڕەبووم بەرچاوم تاریك بوو، تا هێزم تیا بوو زللەیەكم لێ دا، و دەستم بەگریان كرد، وسەرزەنشتم كرد، وعەزابی خوا و لێپرسینەوەی قیامەتم بۆ باس كرد.. بەڵام هیچ كام لەمانە سوودی نەبوو .. بەڵام رۆژێك یەكێك لە ئافرەتەكانی هاوەڵم سەردانی خزمێكیانی كردبوو، خزمەكەشیان موسڵمانێكی عادەتی بوو، وەنەبێ زۆر پێ بەندبووبێ بەدینیشەوە، كەچی لەكات نوێژەكانا بێ ئەوەی پێیان بڵێت و بانگیان بكات منالەكانی هەڵدەستان بۆ نوێژ،دەڵێ: منیش لێم پرسی: ئەوە چۆنە وامنالەكانت بێ جەنگ و جیدال و بانگ كردن و پێ گوتن و یادخستنەوە خۆیان هەڵدەستن بۆ نوێژەكانیان؟

گوتی: وەڵڵاهی شتێكم نییە كە پێت بڵێم جگە لەوە كە: پێش ئەوەی شووبكەم تا رۆژی ئەمڕۆ ئەم دوعایەم كردووەو و بەدڵ پێی لە خوا پاڕاوەمەتەوە: **رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلاةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاءِ (ابراهيم:٤٠)** ئەی پەروەردگار! خۆم و نەوەكانم بكە بەوانەی نوێژ دەكەن وبەرێك و پێكی ئەنجامی دەدەن. ئەی پەروەردگار نزاكەم گیرابكە

گوتی: وەڵڵاهی دوای ئامۆژگاری ئەو خوشكە بەردەوام ئەو دوعایە لە سوجدەكانا لە فەرز و سوننەتەكانا لەپێش سەلام دانەودا و هەموو ئەو كاتانەی ئومێدی دوعا گیرابوونیان تیایە ئەو دوعایە دەخوێنم.. خوشكان وەڵڵاهی ئێستا كچەكەم لە ئامادەییە لەوكاتەوە ئەو دوعایە دەخوێنم ئێستا ئەو بۆنوێژ خەبەرمان دەكاتەوە و بیرمان دەخاتەوە، براكانیشی سوپاس بۆ خوا هەموویان سوورن لەسەر نوێژ، تەنانەت كە دایكیشم هات بۆ ماڵمان و سەردانی كردین، لەلام مایەوەو شەولای ئێمە خەوت ئەو حاڵە كچەكەم سەرنجی راكێشا كە خۆی هەڵدەستێ، و بەسەرمانەوە دەگەڕێت و بۆ نوێژ خەبەرمان دەكاتەوە، دەزانم كە ئێوەش ئارەزومەندن ئەو دوعایە بزانن ئەو دوعایە دوعاكەی حەزرەتی ئیبراهیمە كە لە خوا پاڕایەوەو خوا لە سوورەتی ئیبراهیما بۆمان باس دەكات كە فەرمووی: ئەی لەروەردگار ! خۆم و نەوەكانم بكە بەوانەی نوێژ دەكەن وبەرێك و لێكی ئەنجامی دەدەن. ئەی پەروەردگار نزاكەم گیرابكە .

# تایبەتمەندی یەکانی کەسێتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

نووسینی: دکتۆر عەلی شەریعەتی
وەرگێڕانی بەدەستکارییەوە: حوسەین سەید ئەدهەم

لەراستیدا بیرکردنەوە لە بارەی کەسێتی پێغەمبەرەوە (د.خ) گەلێك سەخت و دژوارە چ جای ناسین و کارکردن لەبارەیەوە، جا بۆ دەربازبوون لەو کارە لایەك و دڵخۆش بوونمان لەوەی مرۆڤ بەهۆی سنورداربوونی عەقڵیی یەوە کە ئەوەندە توانامان بەسەر مەسەلەکەدا دەشکێتەوە کارێك بکەین.

**پێغەمبەرمان (د.خ) لەماڵەوە بۆ دەردەکەوێت ئەویش نەرم و نیانی و خاکی بوونی بوو لەماڵەوە لەگەڵ ژن و منداڵەکانیدا، هەرگیز وکو پێغەمبەرو گەورەیەك لەماڵەوە هەڵسوکەوتی نەکردووە، بەڵکو وەکو هاوسەرو باوك هاوسەرێتی و باوکایەتی خۆی پاراستووە ئاگای لەمافی هەریەکەیان بووە کە چیرۆکی ژیانی خێزانی پڕ بووە لە بەخشندەیی و میهرەبانی.**

* خۆشویستنی پێغەمبەرو پایەداریی ئەو خۆشەویستنە
پێغەمبەر (د.خ) گەلێك تایبەمەندی جیاوازی هەبووە تایبەت بەکەسێتی مەزنی خۆی، من نامەوێت ئەوەی وتراوەو باسکراوە لێرەدا دووبارەی بکەمەوە.
بەدرێژایی ژیانی کارکردنم لەگەڵ پێغەمبەردا (د.خ) هیچ کەسایەتیکم بەرچاو نەکەوتووە کە خۆشویستنی و پایەداربوونی لە ترۆپکدا بووبن، لە هەمان کات و گرنگتر پێکەوە بەردەوام بوون بەدرێژایی مێژوو، دیارە ئەمەش خاڵێکی بەهێزی کەسێتی پێغەمبەرەوە (د.خ) کە گەلەکەی ئەوەندە خۆشیان ویستوەو خۆشیان دەوێت لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خۆشەویستییەش تا رۆژی دوایی پایەدار و بەردەوام دەبێت، لەلایەکی ترەوە ئەوەی گرنگ بێت خۆشەویستنی وەکو مرۆڤێك و وەکو پێغەمبەر بوونیش لە لایەك جیاوازبوون، بەدیوێکی تر وەکو تاکیش خۆشویستنراوە وەکو پێغەمبەریش ژیانی خۆشویستراوە، مێژوو و رابردووی ئەو راستیەمان بۆ دەردەخەن پێویست ناکات لێرەدا ئاماژەی پێ بدەین تەنانەت لەلان غەیرە موسلمانەکانیشەوە دیارە ئەمەش تێکرای گەلەکەی دەگرێتەوە بەجۆرەها رەگەزو زمان و ناوچەو مێژووەوە.

* کەمەندەکێش بوون بەرامبەر پێغەمبەر (د.خ)
یەکێکی تر لەو سیفەت و تایبەتمەندییانەی لە کەسێتی پێغەمبەردا (د.خ) بەدی دەکرێت بەرامبەری کەمەندکێش بوونە بەجۆرێ ئەگەر پێغەمبەر (د.خ) چووبێتە هەر جێگایەك تەنانەت تێپەری کرد بێت بەهەر لایەکدا پاش خۆی هەرکەسێك چووبێتە ئەو جێگەیە ئەو کەس دڵی بۆی لێداوەو تووشی شۆکی کردوە ئیتر کەسەکە زانی بێت کە تەشریفی سەردانی ئەو شوێنەی کردوە یان بۆی باسکرابێت وە یان نەیزانیبێت، بەدیوێکی ئەم حاڵەتە دەروونییە خۆشەویستانە بووە دیارە ئەمەش موعجیزەیەکی مەزنە لەژیانی کەسێتی پێغەمبەر دا (د.خ) خوایێی داوە بەرامبەر بەگەلەکەی.

* بلندنشینیی بوونی پێغەمبەر (د.خ)
خاڵێکی تر لەژیانی تاکە کەسی پێغەمبەردا (د.خ) بەدی دەکرێت بلندنشینی ئەو کەسێتییە مەزنەیە لە ژیانی بەفەڕی دا ئەم راستیەمان بۆ روون دەبێتەوە تەنانەت پێش هاتنی وەحی بۆی پەنای بۆشوێنی بەرز بردووە ئەمەش لەرووی سایکۆلۆژییەوە نیشانەی ورە بەرزی و مەزنی و داننانە بەکەسێتی و بەرجەستە بوونی تایبەمەندی کەسێتیی، چونکە رەفتارو کاردانەوەی کەسێك چیرۆکی واقیعی زمانی ئەو کەسەیە ئەمەش لەکەسێتی پێغەمبەردا (د.خ) بەدی دەکرێت بۆ پەرستش پەنای بردۆتە بەر ئەشکەوتی (حیرا) لەکاتێکدا ئەو شاخی ئەشکەوتە لەتەواوی شاخەکانی دەورووبەری ئەو ناوچەیە بەرزترین و ناسراوترین بووە، یاخود چونی بۆ بەرزترین تەپۆلکەی ئەو ناوە کە تەشریفی شەریفی چۆتەسەری لەکاتی حەجی ماڵئاوادا.

* شکاندنی نەریتە کۆنەکان و دروستکردنی نەریتێکی نوێ
یەکێکی تر لە تایبەمەندیەکانی کەسێتی ئەو کەسە مەزنە شکاندنێن و وەلانانی داب و نەریتە کۆنەکانی رابردوو لەهەمان کاتدا دروستکردنی نەریت و بەهایەکی نوێ بوو بۆ مرۆڤایەتی، دیارە ئەمەش گەورەترین پێشرەویەتی یە لەژیانی ئەو سەردارە دا کەجێی خۆیەتی مرۆڤایەتی لێرەشەوە بیکاتە سەرمەشق و شوێن پێی هەڵبگرێت و ئەو کارو رەفتارو هەڵسوکەوتانە بەهەند بگرێت و کە پێغەمبەر لەسەری رۆشتوون و بەگرنگ و پیرۆزی زانیوون، وەکو یارمەتی دانی خەڵکی لەکاتی سەرقاڵی و ئەرکی خۆیداو و گوێ گرتنی لەسەرە رێ و بەدەمەوەچونی بۆکەسی لە خۆی بچوکتر لە تەمەن و تەنانەت منداڵ و پیرەژن و هتد.. ئەمەش وانەیەکی پەندئامێزە زیاتر بۆگەورەو بەرپرسەکانە، تکایە شوێن کەوتەو خزمەتگوزارو بچوك و ژێر دەستەکانتان فەرامۆش نەکەن! بەڵکو بچن بەهانایانەوە نەك لە لەکاتی خۆی و لەجێی خۆی دا بەڵکو لەوکات و شوێنەی کە بەرامبەر نازانێت و ئەتەکێت و رۆشنبیریی نیە لەسەری تەنانەت خۆتان بکەنە قوربانی و لەکاتی گرنگی خۆتاندا بچن بەدەم خەڵکییەوە.

*پەروەردەی پێغەمبەر (د.خ) گێتیی بوو پێغەمبەر (د.خ) سیفەتێکی مەزن و




بەرجەستەی بووەلە ژیاندا بۆهەموان بوەو وەکو یەکێکیش مامەڵەی لەگەڵ تێکڕای خەڵکیدا کردووە.

بەبڕوای من پێج هۆکار دەبنە هۆی پەروەردەکردنی مرۆڤ ئەوانیش:

یەکەم: دایك.

دووەم: باوك.

سێیەم: قوتابخانەو کلتور.

چوارەم: شارستانیەت.

پێنجەم: ڕۆحی کات و سەردەم.

ئەوەی جێی سەرنجە پێغەمبەر (د.خ) بەدەر بووە لەم پێنج خاڵە. یەکەم دایك و باوکی لە تەمەنی منداڵی پێغەمبەردا (د.خ کۆچی دوایی دەکەن، دیارە لە بارەی قوتابخانەشەوە خوێندەوار بووەو نەچۆتە بەر خوێندن. کۆمەڵگەی عەرەبی ئەو سەردەمەش شێوە جەزیرە بووەو پێنجەمیش سەردەم لەدەست ڕۆم و ئێراندابووە.

بەڕای من بێ بەش بوونی پێغەمبەر (د.خ ) لەم پێنج هۆی بۆ پەروەردە وای کردووە پێغەمبەر بگاتە ئەم پلەیە مەزنەیە لەلایەك ویستی خوایی لەسەر بووەو لەلایەکیی تریش دەرچوونە لە یاساو پەروەردەی مرۆیی راستەوخۆ لەژێر پەروەردەو چاودێری خوادا بووە.

*بەهێزبوونی لەکاتی لاوازییدا

یەکێکی تر لە شتە سەرسورهێنەرەکانی ژیانی ئەو سالارە بەهێزی دەروون و پشت بەخۆبەستنی بووە لەکاتی لاوازیی دەسەڵاتدا، ئەوەتا لە مەکەوە وەدەنراوە و کۆچی کردوە بۆ مەدنیە و دەیەوێت بێت و سەردانی مەککە بکات و تەوافی مالی خوا بکات هەرچەندە ڕێگایان نەدا بەڵام چاو نەترسی خۆی سەلماندو نامەی ناردنی بۆ پاشاو سەرۆکەکانی ئەو کاتە ئەویش بەناوهێنانی خوا و سەلماندنی پێغەمبەرێتی خۆی.

*پێغەمبەر لە ماڵەوەدا

سیفەتێکی تری پێغەمبەرمان (د.خ) لەماڵەوە بۆ دەردەکەوێت ئەویش نەرم و نیانی و خاکی بوونی بوو لەماڵەوە لەگەڵ ژن و منداڵەکانیدا، هەرگیز وکو پێغەمبەرو گەورەیەك لەماڵەوە هەڵسوکەوتی نەکردووە، بەڵکو وەکو هاوسەرو باوك هاوسەرێتی و باوکایەتی خۆی پاراستوەو ئاگای لەمافی هەریەکەیان بووە کە چیرۆکی ژیانی خێزانی پڕ بووە لە بەخشندەیی و میهرەبانی.

*موحەممەد هاودەمی بێ نەوایان

نموونە گەلێکی بەرجەستە لەژیانی پێغەمبەردا (د.خ) بەدی دەکرێت لەسەر هاودەمی و پشتیوانی هەژارو ستەملێکراو تەنانەت بێسەرپەرستانیش، خۆ ئەگەر سیفەتێکی پێغەمبەرێتی خۆی جێبەجێ کردبێت ئەوا پێش بوونی بە پێغەمبەر ئەو سیفەتەی تێدا بووە.

*مەرگی پێغەمبەر

جوانتر لە هەموو تایبەتمەدیەکانی تری پێغەمبەر (د.خ) مەرگ بوو، مەرگی ئەو هەموو کەسانە ئاساییانە تا دەگاتە ئازیزانمان تا ئەندازەیەك جێی سەرنجە ئیتر بەتراژیدیا بێت یان ئاسان بەڵام مەرگی پێغەمبەر (د.خ) زۆر حیکمەتی تێدابەدی دەکرێت بەو هەموو ئارامی و بێدەنگی و قوڵییەوە هێشتا پەییمان بە جوانی و پەندو وانەکانی نەبردووە.

سەرەتا ماوەی سالێك دەخایەنێت واتە لەحەجی مالئاواییەوە تا کۆچی یەکجاری ئەویش بەنەخۆش کەوتنی، لەلایەکی ترەوە لەهەڵسوکەوتی دا هەستی پێ دەکرا بەرامبەر هاوسەرو یارانیدا، مردنیش هونەرە پێویستە مرۆڤ وەکو باقی هونەرەکانی فێری بێت و ئەنجامی بدات و تاقی بکاتەوە ئەو کەسەی دەزانێت چۆن دەمرێت بێگومان زانیویەتی چۆن بژیت، مەبەست لەمامەڵەیە لەگەل مردندا بەتایبەتی مردنی لەناکاو، کەسی مەزن دەزانیت دنیا بۆ ژیان نیە بەڵکو بۆ مردنیشە چونکە ئەویش کارو فرمانێکی مەزنە وەکو ژیان فەلسەفەو حیکمەت و هونەری خۆی تێدایە. لێرەدا پێغەمبەر (د.خ) باش لەم لەدۆخ و مەسەلەیە گەیشتبوو. ئەوسا حەجی مالئاوایی چەندین وانەمان لەبارەی مەرگی پێغەمبەرەوە (د.خ) نیشان دەدات وەکو چون بۆ مەککەو شەیداییوونی بۆ خاك و نیشتمانی و سەردانی کردنی کەعبەی پیرۆزو ماچ کردنی بەردە ڕەشەکەو دوو رەکات نوێژی سونەت و پاشان هاتوچۆی نیوان سەفاو مەروە، لەهەموو گرنگتر ووتارە بەپێزەکەی بوو لەوتاری مالئاواییداو وەسیەت کردنی بۆپاش خۆی ئەوەش لای جەنابتان پەنهان نییە حەز ناکەم دریژەی پێ بدەم.

پاشان گەرانەوەی لەگەڵ سوپایەك لە هاوەڵی بەڕیزو بەرنوێژی کردن و وتاردانی و هەلسوکەوتی لەنێو ماڵ و منداڵیدا و هەستی غەریبی تیکەڵ بە ئازارەکانی بوو بوو تا ئیتر ئەوەی کە توانای ئامێنێت و ئامۆژگاری موسلمانان دەکات بەدەستگرتنیان بەم ریبازەکەیەو لانەدانیان بۆ هیچ بەرنامەیەکی تر و هاوەڵ بریار نەدەن بۆ خوا پاش ئەوەی رینموونی کردن.

ئەگەر حیکمەت و فەلسەفەو هونەری مان و نەمان و ژیان و مردنی پێغەمبەر(د.خ) تەنها دەستنیشان بکەین زیادە رۆییمان کردووە ، بەڵکو پێویستی بەزیاتر وتن و نوسین و لیکۆلینەوەی تیۆری و پراکتیکی هەیە.

-----------

سەرچاوە: دکتر علی شریعتی (١٣١٢- ١٣٥٦) شمسی - ویژگیهای شخصیت پیامبر/ چاپ دوودم، ١٣٧٨ چاپخانەی (پژمان) تهران.

موستەفا زەمانی

# باس لەزنجیرە فیلمی یوسفی راستگۆ دەکات

زنجیرەدرامای (یوسفی راستگۆ) کەسالی رابردوو لەکەنالەکانی تەلەفزیۆنی نمایشکراو جەماوەرێکی زۆری لەخۆی کۆکردەوەو بۆ چەندین زمانی جیاجیای جیهانی دۆبلاژکراو نمایش کرا، پالەوانی ئەو درامایەلەدیدارێکی تەلەفزیۆنیدا ئاماژەی بەوەکردووە، ئەو زۆر کاریگەر بووەبەکەسایەتی پێغەمبەری خوا (یوسف) (سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت).

(موستەفا زەمانی) تەمەن بیست و هەشت یالان، پالەوانی زنجیرەدرامای (یوسفی راستگۆ) کەبە(یوزارسیف) یش ناودەبرێت بۆ کەنالی (CNN) رایگەیاندووە، ئەو لەو کاتەی سەرقالی دەرهێنانی ئەو درامایەبووەو نمایشەکانی نواندووەزۆر ترساوە، چونکەتاکو ئێستا تاکەدراما بووەوێنای خۆی لەسەر شێوەی (یوسف) دەربخات و خۆی بنوێنێت.

(موستەفا زەمانی) دەلێت: ئەو درامایەماوەی سێ سالی خایاندووەو لەکاتژمێر (٤) ی بەیانی دەستی پێکردووەو لەکاتژمێر (٨) ی ئێوارەکۆتایی پێهاتووەو لەچەند جێگەیەکدا وێنەی خۆی گۆڕیوە، وەك قژی و شێوەی دەم و چاوی.

ئەو دەلێت: ڕاستەمن لەسەر شێوەی (یوسفی ڕاستگۆ) خۆم نواندووە، بەلام جوانی من و یوسفی پەیامبەری خوا بەشێوەیەکی یەجگار زۆر جیایە، نکۆلی لەوەش ناکات کەئەو زۆر کاریگەر بووەلەخوڕەوشت و کەسایەتی ئەو پێغەمبەرەو هیواداریشەبەسەر هەمان ڕێبازدا بڕوات.

زەمانی دەلێت: ئەو لەسەردەمی ئێستا دەژیێت، بەلام زۆر خۆی سەرقال کردووە بەژیاننامەی (یوسفی ڕاستگۆ) و زۆر شتی لەبارەیەوەخوێندۆتەوەو گوێی بۆ



زۆر گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەو گرتووە.

لەبارەی جیاوازی و پێکچوونی کەسایەتی زەمانی لەدراماکەلەکاتی مندالی و گەورەبوونیدا، ناوبراو باس لەوەدەکات کەئەو مندالەی لەبچووکی ئەو ڕۆلی تێدا بینیوە، ئەوەکوڕی مامی بووە.



لەبارەی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو ڕەخنەنانەی کەلەلایەن ناوەندەجیاجیاکان ڕووبەڕوویان کراوەتەوە، ئەو ئەکتەرەسینەماییەدەلێت: بۆ ماوەی پێنج سال تاوتوێی چۆنییەتی دەرهێنانی ئەو زنجیرەدرامایەکراوەو پرس و ڕا بەزۆر کەس کراوەبەپلەی یەکەمیش زانایانی ئیسلامی، بەلام ئەو زنجیرەیەزنجیرەدرامایەکی مێژووییە، نەوەك تەواو ئایینی بێت.

شایانی لەمێژووی ئێراندا هیچ فیلمێك وەکو یوسفی راستگۆ بودجەی بۆخەرج نەکراوە کەتێکڕای خەرجییەکەی گەیشتە ملیارێك توومەنی ئێرانی ..

هەروەها دوایین کاری موستەفا زەمانی بریتیی یە لەبەشداریکردنی لەفیلمێکی سینەمایی ئێرانی بەناوی چیرۆکی پەریا کەژمارەیەك ئەکتەری ناوداری ئێرانی تێیدا ڕۆلیان گێڕاوە ماوەی چەند مانگێکە لەسینەماکانی ئێران نیشانی ئامادەبووان دەدرێت .

**ئەلوەندکوێستانی**

# موستەفا عەبدولجەلیل بناسە



موستەفا موحەممەد عەبدولجەلیل وەزیری دادی پێشوی حکومەتی لیبیا لەساڵی ١٩٥٢ ی، زایینی لە شاری بەیزایە لەدایك بووە، دادوەر موستەفا موحەممەد عەبدولجەلیل سەرۆکی یانەی ئەخزەری لیبی بووە لە شاری بەیزا، خۆیشی یاریزانێکی بەتوانی هەمان یانە بووە لەهێڵی ناوەڕاست و تا ئێستاش لەگەڵدابێ، لە ریزی یاریزانە کۆنەکانی یانەکەدا یاری دەکات، ناوبراو خاوەنی مێژوویەکی دورو درێژە لە دژایەتی کردنی گەندەڵی و گەندەڵکاراندا، لەشوێنی لەدایك بوونیدا خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩٧٠ بۆ تەواوکردنی خوێندن روو لەزانکۆی قاریونس لە شاری بنغازی دەکات، دوای کردنەوەی زانکۆی ئیسلامیی لە شاری بەیزا گەڕایەوە بۆ ئەوشارە و لە ساڵی ١٩٧٥ ی زایینی، بەشی ( القانون والعلوم السیاسیە )ی، بەپلەی نایاب تەواو دەکات و پاشان کۆمەڵێك پلە و پۆستی گرنگی پێدەدرێت کەبریتین لە:

دامەزراندن بەپلەی دادوەر لە ساڵی ١٩٧٨ .

پێدانی پلەی راوێژکاری یاسایی لەساڵی ١٩٩٦ .

دامەزراندنی بە بە سەرۆکی دادگای تێ هەڵچونەوە لەساڵی ٢٠٠٢ .

پێدانی پۆستی سەرۆکی دادگای شاری بەیزا لەساڵی ٢٠٠٦ .

دامەزراندنی بە وەزیری داد لەحکومەتی لیبیا لە ساڵێ ٢٠٠٧ .

لەدەدەمی هەڵگیرسانی شۆرشی ١٧ی شوباتی ٢٠١١ دژی رژێمی قەزافی دامەزرێنەرانی ئەنجومەنی ئینتیقالی لیبیای دامەزراند .

لەئینتەرنێتەوە

## وتەی بەشێك لەسەرکردە و وەزیرانی وڵاتانی رۆژاوا لەبارەی موستەفا عەبدولجەلیل

= ئەحمەد داود ئۆغلۆی وەزیری دەرەوەی تورکیا: لە ماوەی شەودا ئێمە خەوتبووین کاتێك هەستام لە ئوتێل وا گومانم برد کە موستەفا عەبدولجەلیل چوویێت بۆ پیاسە بۆ سەرشەقامەکانی تورکیا!! بەڵام لە راستیدا ئەو چووبوو بۆ نوێژی بەیانی بۆ یەکێك لە مزگەوتەکان.

= دێیڤد کامیرۆنی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا : موستەفا عەبدولجەلیل یەکەم کەسایەتییەکی ناوداری عەرەبیە کەنوێژی بەیانی لە مزگەوتێك لە مزگەوتەکانی لەندەنی پایتەخت بکات.

= نیکۆلاسارکۆزی سەرۆکی فەرەنسا: موستەفا عەبدولجەلیل یەکەم کەسە گفتوگۆی لەگەڵدا بکەم و هەستێت بۆ نوێژ لە دەمی گفتوگۆدا.

# دکتۆر عەلی قەرەداغی بەسەرۆکی باڵای ئەنجومەنی راوێژکاری بۆ نزیك بوونەوەی مەزهەبە ئیسلامییەکان هەڵبژێردرا ..



رۆژی چوار شەممە ١٤-٩-٢٠١١ لەریباتی پایتەختی مەغریب پرۆفیسۆردکتۆر عەلی محییەدین قەرەداغی بەکۆی دەنگ بەسەرۆکی باڵای ئەنجومەنی راوێژکاری رێکخراوی نزیك کردنەوەی مەزهەبە ئیسلامیەکان هەڵبژێردرا کەسەر بەرێکخراوی هاریکاری ئیسلامییە.

دکتۆر ئەحمەد خالید بابەکر ئەمینداری کۆمەڵەی فیقهی ئیسلامیی دەولی کەسەر بەرێکخراوی هاریکاری ئیسلامیە، لەکۆبونەوەی دەستپێکدا لەبارەگای هەمیشەی رێکخراوی ئیسلامیی بۆ پەروەردەو زانست و کولتور کە بە (ئیسیسکۆ) ناسراوە وتی: ئەمرۆ لەهەموو کاتێك زیاتر جیهانی ئیسلامی پێویستی بەهەوڵ و تێکۆشان هەیە بۆ کارکردن لەنزیك کردنەوەی مەزهەبە ئیسلامیەکان بۆ ئەوەی هەمویان لەسەر ووشەی یەکتا پەرستی کۆبکەینەوە، کەئەمەش گونجاو بێت لەگەڵ دەقەکانی قورئانی پیرۆزو فەرمودەکانی پێغەمبەری ئازیز.

هەروەها لەکۆبوونەوەی یەکەمدا دکتۆر ئەحمەد تۆفیق وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی (ئیسیسکۆی ) کرد لەهەوڵەکانیدا بۆ نزیك کردنەوەی مەزهەبە ئیسلامیەکان، شایەنی باسە لەخولی سێیەمی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی باڵای راوێژکاری بۆ نزیك کردنەوەی مەزهەبە ئیسلامیەکان ژمارەیەکی زۆر لەزاناو کەسایەتی ناودار لەجیهانی ئیسلامیدا بەشداری تێدا دەکەن.

## فەرەنسا

# جارێکی تر گۆڕی موسڵمانەکان پیس کرا ..

سەرچاوە هەواڵییەکان باس لەوەدەکەن، لەگۆڕستانێکی موسڵمانەکان لەباشووری خۆرئاوای فەرەنسا گۆڕی ٣٠ موسڵمان لەلایەن رەگەز پەرستەکانەوە پیس کراوە، ئەوەش چەند بارەبوونەوەی ئەو دیاردەیەو تاکو ئێستاش هیچ رێو شوێنێکی بۆنەگیراوەتەبەر.

لەمبارەیەوە سەرچاوە هەواڵییەکان بڵاویان کردۆتەوە، دوێنێ لەگۆڕستانی (کارکاسۆن) کەدەکەوێتە باشووری خۆرئاوای فەرەنسا گۆڕی ٣٠ موسڵمان لەلایەن رەگەزپەرستەکانەوە پیس کراوەو دەستەواژەی رەگەزپەرستی و نازییەکانی لەسەر وێنەکراوە.

لەلایەن خۆیەوە (جان کلۆد بێریز) ی سەرۆکی شارەوانی (کارکاسۆن) رایگەیاندووە، گۆڕەکان تێکنەچوون تەنیا دەستەواژەی رەگەزپەرستی تێدانووسراوە، نیگەرانی خۆشیان لەئاست ئەو کارە دەربڕیوەو پاڵپشتی خۆشیان بۆ موسڵمانەکان نیشانداوە.



## ئەگەر بەختەوەریت دەوێت پێویستە بەردەوام دوعا بکەیت

*پاڕانەوەدلەڕەوشتی بەندەکانی لە خواترسانە.
* پاڕانەوە چەکی هەژاران و ستەم لێکراوانە بەرامبەر ستەمکارانیان.
* پاڕانەوەبەڵگەیە لەسەرهەبوونی باوەڕو داننانە بەپەروەردگاریتی پەروەردکاردا.
* پاڕانەوەدەرگای گفتوگۆو قسەکردنت بۆ دەکاتەوە لەنێوان تۆو پەروەردگاردا.
* پاڕانەوەهۆیەکە بۆبەرزی هیوا و خواست و ئامانج لەدنیا و دوارۆژدا.
* پاڕانەوە مرۆڤ ڕزگاردەکات لەخۆ بەگەورەزانین و زەلیلی خۆی بۆ پەروەردگاردەردەخات.
* پاڕانەوە هۆیەکە بۆلادانی تووڕەیی پەروەردکار.
* پاڕانەوە هۆیەکە بۆ فراوان بوونی سینە.
* پاڕانەوە هۆیەکەو بەڵگەیە لەسەر پشت بەستنت بە پەروەردگارەکەت.
کەواتە: ئەگەر نەخۆشی...ئەگەر هەژاری ...ئەگەر تاوانکار و تاوانباری ...ئەگەر دڵتەنگی .. ئەگەربەهەشتت دەوێت...ئەوا بەردەوام دەستەکانت بۆئاسمان بەرزکەرەوەو بە زەلیلی وئومێدێکی تەواو لەپەروەدگاری جیهانیان بپاڕێرەوە ..

## نارەزایی خەڵکی ئەڵمانیا لە کاتی سەردانی کردنی پاپای ڤاتیکان بۆ ئەو وڵاتە...!!

لەگەڵ گەیشتنی پاپای ڤاتیکان" پاپ بندیکتوس" شانزەییەم بۆ" بەرلین" خەڵکی دەستیان کرد بە نارەزایی دەربرین بە هۆی ئەو کارە نەشیاوانەی کە پاپای ڤاتیکان دەیکات بە تایبەت دەستدرێژی کردنە سەر منداڵان.. لە لایەن قەشەکانەوە..نزیەکەی چوار رۆژە کە پاپای ڤاتیاکان لەوێیە خەڵکی خوپیشاندان دەکەن." پاپا بندیکتوس" کەلەگەڵ پەیامنێری بوو بە فرۆکە دەیانگواستەوە وتی: من هیچ شتێك نازانم سەبارەت بە خۆپیشاندانی خەڵکی...هەروەها ئامادەش نەبوو کە لێدوانی زیاتر بدات زیاتر سەبارەت بە بە هۆی ئەو دەستدرێژییە سێکسیانەی دەیکاتە سەر منداڵان... هەر لەگەڵ گەیشتنی پاپای بۆ هەموو وڵاتە جیاجیاکانی دونیا خۆپیشاندانی لێدەکەوێتەوە بە تایبەت کە چووە بەریتانیا دژی خۆپیشاندانیان ساز کرد..

سەرچاوە: اخبار جهان اسلام

و/ لە فارسییەوە..هەردی ئەنوەر



## سامی یوسف: ئازادی هیچ کات بە بەلاش دەست ناکەوێت!!



سامی یوسف هونەرمەندی ناسراوی جیهانی لە کۆنفرانسێکی هەواڵی لە میسر ئەوەی ڕاکەیاند کە سرووودی" I am your hope "بۆ شۆڕشگێڕانی میسری وتووە کە زۆر کاریگەری هەبووە لە سەری و بەردەوام دەبێت و دەڵێت:" کە لە تیڤیەکانی میسر و جیهان دەمبینی لاوانی میسر لێدان و کوتەك دەخۆن.. وام دەزانی لە من دەدەن.. ئەم سرووودەشم بۆیە وتووە زیاتر لەبەر خاتری شۆڕشەکانی ئەم دواییەی میسر و ئاسیای ناوەراست.." هەروەها ئەلبوومی سێ یەمی بەناوی Wherever you are .. کە لە دوازدە سروود پێکهاتووە خستە بازەڕەکانی میسرەوە.سامی وتی:" ئازادی هیچ کات بە بەلاش دەستمان ناکەوێت بەڵکو دەبێت لە میقابلیا شتێك بدەین.. من بە داهاتووی میسر گەشبینم و چوار ساڵ لێرە ژیاوم و ئێستاش باشترین یادکاریم لێرە هەیە لەوانەش لاوانی میسر.. کە توانای باشیان هەیە و خۆیان دەیانەوێ بەرپرسیاری بکرنە ئەستۆ.. دەشیانەوێ بەشێك بن لە گۆڕانکارییەکان".

هەردی ئەنوەر

سەرچاوە: سایتی تابش

# نامەی کوڕێك بۆ هاوسەرەکەی



ئا : هەردی ئەنوەر

کوڕێـــــــك پـــــــێش ئـــــەوەی"دەزگیرانەکـــــەی" هاوســـــەرەکەی بگوازێتـــــەوە نامەیـــەکی بـــۆ نووســـی و تێـــدا هەندێ داواکاری تیا هەبووبۆی.. ئەمـــەش لەبـــەر خـــاتری خـــوای گـــەورە و پاشـــان لەبـــەر خۆشـــی ژیانیـــان...! تـــا ســـوودیان بـــۆ هەموو ئەو کەســانە بـەبێت کـە خـوای گـەورە ڕێـزی لێنـاون..!! بۆیە پێ دەڵـێ : مـن دەزانم تـۆ پـەروەردەی جـوان کـراوی بـەڵام وەك بیرهێنانـەوە ئەمانـەت پـێ دەسپێرم لەوەی کە دەزانی لەوەی کە نازانی ئێستا بزانە!!

هاوســـەرەکەم! ســـەلامی خـــوای گـــەورەت لێبێـــت و بەرەکـــەت و میهرەبانی خوای گـــەورە بڕژێـــت بەســـــەردا.. هیـــــوادارم کـــــە هیواییەکی سەرەکی منە بۆ خوا بژیت و ئیش و کاروباری ژیانـت بەناوی خوای گەورەو دەست پـێ بکەی"بسم الله".. نەك بـەناوی هـیچ کەسـێکی تـر..!! "ئـەو اخۆشەویست بووی".

هاوسەرەکەم! ئەوە بزانە کە ژیان بە بێ ی پەروەردەی ئیسلامیانە ژیانێکی تاڵە بۆ ئینسانیك کـە خۆی بە موسڵمان بزانێـت. بۆیـە هـەر لەســـەرەتای ژیانـــت بـــەو پەروەردە جوانە دەست پـێ بکـە کـــە ئیـــسلام پـــێ ڕازییـــە و پێغەمبەر"صلی الله علیه و سلم " فێـری ئیمانـدارانی کـردووە.. "ئەو اخۆشەویست بووی".

هاوســـەرەکەم! پـــێش ئـــەوەی بەدەســـتی خۆمـــان، خۆمـــان لـــە ناوچوون بەری و ژیـانی پـێ تـاڵ کەین؟. بـا ئـەو ڕێگایانـەی کـە ژیانی پێ تاڵ دەبێت نەیکـەین و فێری بین کە ئەوە چ ماناییـەکی خراپی هەیە بۆ هەردوو لامـان.. وەك ڕێزنـەگرتنی خـزم و کەسـی یـەکتری و دوور لەکـەس وکـار، قسەی هێنان و بردن کە کـە لـە فەرهـەنگی ئیـسلامدا جێگـای نابێتەوە.. قەناعەت نەکردن بـەو ژیانەی کە دێتە پێش..!! "ئـەو اخۆشەویست بووی".

هاوســەرەکەم! تـۆ لـە ژیـانێکی ترەو دێیتە ژیانێکی تازەوە بۆیـە ئەو هەڵس و کەوتەی کـە پێـشتر کردووتەو لەگەڵ ژیانی هاوسەری نـاگونجێ دەبـێ واز لـێ بهێنـرێ هەرچەندە هەر لەدوای مـارەبڕین گۆڕانکارییـــەکی-سروشـــتی- ڕوودەدات کـە ئەمـەش ڕەحمـی خـوای گەورەیـە.. بـەڵام خـوای گەورە هەموو شتەکانی بـۆ پـاك نـەکردووین!! بـەڵکو هەوڵـدانی پێکەویی دەوێـت..وەك گـەڕان و گەشت کردن و سەفەر کردن نابێ بە بێ پرسی مێردەکەت بێت... بۆیە ئەمەش کە دەکرێ بۆ زیاتر بەرزبوونەوەی کەسایەتی خـۆت و ژیانتـــە. "ئـــەو اخۆشەویـــست بووی".

هاوسەرەکەم! گـەر میوانێکمـان هـات دەبـێ بـەو پـەڕی ڕێـز و خۆشەویـستییەوە پێـشوازی لـێ بکـردرێ و گـەر خـزم بـوو یـان بێاگانە.. بێگانە بێت دەبێ هـەر زۆر ڕێـزی لـێ بگـیردێ، چ لـە ڕووی مـــاددی چ لـــە ڕووی مەعنـــەوی چـــونکە یەکـــەم ڕووبەڕووبونەوەیە!! کـە ئەمـەش زیاتر چێژ بە ژیان دەبەخشێت..!! "ئەو اخۆشەویست بووی".

هاوسەرەکەم! گەر لـە بـیرم چـوو سەر بۆ خوا نەوی کـەم بـە بـیرم بهێنەرەوەو فێرم کە زیاتر چێژ لە سەر نەوی کردنـە بهێـنم.. گـەر وات کرد ئەوا خوای گەورە زیاتر بەرەکـەت دەخاتـە ژیانمانـەوە! "ئەو اخۆشەویست بووی".

هاوسەرەکەم! فـەقیری و نـەداری سەری ئینـسان قـورس دەکـات! نەکەی بەو شتەی خـوای گـەورە

رازی لەسەرە ناشکور بێت و لەسەر یەك سکە بڕۆی بەڵکو دەبێ فێری سوپاسگوزاریم بکەی بۆ خوای گەورە تا خوای گەورە دەروو دەکاتەوە!! "ئەو اخۆشەویست بووی".

هاوسەرەکەم! دەزانم کە لەگەڵ دەرچوونت لە ماڵی باوکت دڵت بچوك دەبێتەوە بە تایبەت کاتێك دەم و چاوی کەسەکانی بەرامبەرت دەبینی قورگ بەند دەبێت و کانیاوی فرمێسکەکانت دەتەقن کە مافی شرعی خۆتە بۆیە ئاگاداری ئەوەش هەم سوپاست دەکەم کە ئەوەش لەبەر منە!! "ئەو اخۆشەویست بووی".

هاوسەرەکەم! ژیان ڕێگاییەکە بەرز و نەزمی زۆر تێدایە.. بۆیە دەبێ لەبەرزییەکان دەستی یەك بگرین تا سەرکەوین و لە نزمیەکان لەپشت خۆمەوەت دەستت راگرم تا پێت هەڵنەچرەخێ..! ئەو کاتە تێ دەگەین چەند باشمان کردووە لەوەدەچی کەسێك ئێمە ببینێ بۆیە خوای گەورە دڵمان خۆش دەکات کە ئاگاشمان لە خۆمان نییە!! "ئەو اخۆشەویست بووی".

هاوسەرەکەم! نەکەی دڵی دراوسێ بشکێنێ، نەکەی دڵی منداڵانی گەرەك بشکێنی، نەکەی رووت گرژبێت.. لەوەدەچی دراوسێکانی خۆتان"لای خۆتان" جیاوازی هەبێت لەگەڵ ئەمانەی ئێمە! بۆیە مهرەبان بە تا لێت فێربن.. کە فێر بوون ئەو کات دەزانن چۆن مامەڵەت لەگەڵ دەکەن بەو پەڕی خۆشەویستییەوە.. لێرەش بە قسەی خوا و پێغەمبەر"صلی الله علیه و سلم "ت کرد بۆیە سەری ئیسلام و خۆت و منت بەرز کرد کاتێك وات کرد "ئەو اخۆشەویست بووی".

هاوسەرەکەم! نەکەی تورە بیت و نەکەی قسەی ئەمەو ئەو کارت تێ بکات.. لەوەدەچێ هەندێ کەس حەزیان بە ژیانت نەبێ بۆیە قسەیەك دڵنیابە ئەو کات بەو پەڕی شێوازی جوان دەریبڕە.. خوای گەورە لە سورەتی حوجورات دەفەرموێ لە ئایەتی٦"ئەوانەی برویان هێناوە! ئەگەر کەسێکی متمانە پێکراو"فاسق" هەواڵێکی بۆ هێنان خێرا بڕوای پێ مەکەن بەڵکو لێ ی بکۆڵنەوە...نەوەك بە نەزانی بەخەڵکیا هەڵبتەقێن و ئازار و بێزاریان بدەن..ئەوجا لەو کارەی کردوتانە پەشیمان ببنەوە. "تەفسیری رامان". هەوڵ بدە تورەی خۆت بخۆیتەوە و تا بەو هۆی خواردنەوەی ئەو تورەییەت بەرێز بێت دڵنیابە گەر وا بکەیت سەرکەوتن بۆ تۆیە.. دەبێ هاوسەرەکەشت ئەوە بزانێت کە تۆ هەستت بە شتێك کردووە. "ئەو اخۆشەویست بووی".

هاوسەرەکەم! کە وات کرد منیش ئەم چەند خاڵەت پێشکەش دەکەم:

١- خۆشەویستییەکی تەواوت بۆ ئاشکرا دەکەم.

٢- لە ناخۆشی و خۆشی تۆدا بەشدارم و دووریەك لە تۆ زیاتر هەست پێ دەکەم.

٣- مافی ئەوەت دەدەمێ کە ئیسلام بە هەر ئافرەتێکی بەخشیوە.

٤- زوو زوو پێت دەڵێم"تۆم خۆش دەوێ ی و چەپکێ گوڵی سروشتیت پێشکەش دەکەم تا ئاوی بدەیت و سیس نەبێ.. هەر چەنە تەمەنی گوڵەوکورتیش بێت..!!

٥- هاوبەشی ژیانتم گەرچی چارەنووسی تەمەنمان نازانین چەندە.

٦- ئەوەی بۆم دەکەی و پێم ناخۆشە بۆت دەرنابڕم و ئەوەی دڵت خۆش دەکات لە لایەن منەوە! هەر پێت ناڵێم تا زیاتر تۆم خۆش بوێت.

٧- هەر شتێك دەیکەم لە ناخی دڵمەوە بۆت دەردەبڕم تا دڵت بیگرێ و پێت خۆش بێت کە لە بەر تۆ بووە.

٨- ئەوەی دڵت خۆش دەکات دەیکەم.

٩- ئەوەی پێت ناخۆشە نایکەم.

١٠- رێزی هەموو ئەوانە دەگرم کە رێزیان دەگری!!

**هاوسەرەکەم! ژیان ڕێگاییەکە بەرز و نەزمی زۆر تێدایە.. بۆیە دەبێ لەبەرزییەکان دەستی یەك بگرین تا سەرکەوین و لە نزمیەکان لەپشت خۆمەوەت دەستت راگرم تا پێت هەڵنەچرەخێ..! ئەو کاتە تێ دەگەین چەند باشمان کردووە لەوەدەچی کەسێك ئێمە ببینێ بۆیە خوای گەورە دڵمان خۆش دەکات کە ئاگاشمان لە خۆمان نییە!! نەکەی دڵی دراوسێ بشکێنێ، نەکەی دڵی منداڵانی گەرەك بشکێنی، نەکەی رووت گرژبێت ...**

# پڕۆژەی بەختەوەری چۆن و بۆچی؟

**گۆڤاری بەختەوەری**

لەساڵی (٢٠٠٤)وە، بیرمان کردەوە لەوەی پڕۆژەیەکی فیکری و ئیمانیی و ئەخلاقی و خێرخوازی لەسەر بنەمای سوودگەیاندن بەکۆمەڵگە و چینی هەژاران دابمەزرێنین، بۆئەوەی ئێمەش وەکو خزمەتکارێکی ئەم میللەتە و وڵاتە خزمەتێکی شایان بگرینە ئەستۆ، لەوە دەچێ گرێدانی ئەم کارانە بەلای هەندێ کەسەوە بەیەکەوە قورس بێ، بەڵام سوپاس بۆ ئەم ساتەوەختە زۆر کاری لەم بورانەکراوە:

ـ سەرەتا تەنها لەبەرنامەیەکی رادیۆیی دەستمان پێکرد بەناوی (بەختەوەری) کەزیاتر باس لە هۆکارەکانی بەختەوەربوونی کۆمەڵگا و تاکی مرۆڤمان بەگەشەکردنی ئیمانی و دەست گرتن بەقورئان ومیکانزمی کاری رۆژانەمان دەکرد، سوپاس بۆ خوا کاروپڕۆژەی خزمەتی خێرخوازی و ئاوەدانی و کاری راگەیاندنمان دەستی پێ کرد و خزمەتێکی بەرچاومان پێشکەش کرد چ وەك بەرنامەی رادیۆیی و چ وەك کاری خێرخوازی و یارمەتی دانی هەژاران و بێ باوکان و ناردنی زیاتر لە(١٠٠٠) نەخۆش بۆ دەرەوەی هەرێم و چارەسەرکردنیان.

لەوکاتەناخۆشانەی ئابلۆقەی ئابووری و شەڕی ناوخۆ رۆڵی بەرچاومان هەبوو لە هێورکردنەوە و دەست گرۆیی کردنی خەڵکی ستەمدیدە، ئەمە تەنها بۆ مێژوو و بەرچاو رونیەك، سوپاس بۆخوا لەدەمی رووخانی رژێمی پێشووی بەعس، پڕۆژەی (بەختەوەری)مان، دامەزراند بە بەرنامەی ئیمانی و رۆشنبیری و کۆڕو سیمینار و ئاهەنگ و دواتریش کاری خێرخوازی دەستمان پێکرد و دواتر لە ٦-٦-٢٠٠٦ توانیمان لەرێگەی تۆڕی ئینتەرنێتەوەپڕۆژەکەمان بەدەرەوەی کوردستانیش ئاشنابکەین و بەهەردووزمانی کوردی وفارسی کاروپڕۆژەکانمان بڵاوبکەینەوەکەسوپاس بۆخوا گەیشتەئەورادەیەی گۆڤارێکی مانگانەش دەربکەین

....بەکورتی تا دەرچوونی ئەم گۆڤارەی بەردەستتان ئەم چالاکیانەئەنجام دروان، خوای گەورە لێمان قەبوڵ بکات.

١ـ پێشکەشکردنی (١٠٠٠)بەرنامەو کۆڕو سیمینارو ئاهەنگ و زیندوکردنەوەی بۆنەکان بۆبانگخواز حاجی کاروان لەدوای گەڕانەوەی لەوڵاتی ئەڵمانیالەساڵی ٢٠٠٣ کەماوەی سێ ساڵ لەشاری دۆرتمۆند نیشتەجێبوو.

٢ـ زیندووکردنەوە کاری بانگخوازی (دعوە)و کردنە بەری رۆحێکی تازە و بووژاندنەوەی ئەو حاڵەتە.

٣ـ سوپاس بۆخوا لەرێگەی پڕۆژەکەمانەوە سەدان گەنجی کوڕو کچ خوا هیدایەتی داون ودەستیان بەدینی خوای گەورە گرتووە.

٤ـ دابەشکردنی هەزارەها کاسێت و سی دی لەسەرتاسەری کوردستان و دەرەوەی کوردستان و دوابەرهەمیشی لەشاروشارۆچکەکانی کوردستانی رۆژهەڵات .

٥ـ چارەسەرکردنی زۆربەی کێشە کۆمەڵایەتییەکان و کێشە دەروونییەکان و گرفتی گەنجان.

٦ـ یارمەتی دانی قوتابیان لە زۆربەی بوارەکان.

٧ـ دروستکردنی کاری خێرخوازی ئەم بەشانەی لەخۆگرتووە.

+ کەفالەت کردنی منداڵانی بێ باوك کە تائێستا هەزارەها خێزان یارمەتیان وەرگرتووە.. لە حاڵی حازریش زیاتر لە ٦٠٠ خێزانی بێ باوك مانگانە یارمەتیان بۆ دێت لەلایەن خێرخوازان هەرخێزانی لە ٥٠ هەزار دینار کەمتر وەرناگرێت ئەمە جگە لەوەش دابەشکردنی بەردەوام لە (جل و بەرگ و خواردن گۆشت و پێداویستی قوتابخانە و چارەسەرکردنیان و فێری پەروەردەی ئیسلامیی و قورئان خوێندیان .

+ دروستکردن (٨) خانو بۆ خێزانی بێ باوك.

+ دروستکردنی (دوو مزگەوت)ی گەورە، بەشداری کردن لەئاوەدان کردنەوەی مزگەوتەکانی تر.

+ یارمەتی دانی(دەیەها نەخۆش)و چارەسەرکردنیان.

+پڕۆژەی هاوسەرگیری بەیارمەتی ماددی زیاتر لە (٢٠) و(٣٠)خێزان پێك هێنراوە و یارمەتی دراون.

+ دابەشکردنی هەزارەها قورئانی پیرۆز و نامیلکە.

+ چاپکردنی پەیامەکانی بەختەوەری و کردنیان بە نامیلکە و کتێب وەکو: ناوەجوانەکانی خوای گەورە، ژیانی پێغەمبەران و بابەتەکان بەختەوەری و بەرەو بەهەشت و هتد ...

+ دامەزراندنی سایتی بەختەوەری کە سوپاس بۆ یەکێکە لەوسایتە بەرچاوانەی کە رۆڵی خۆی بینیوە بۆ گەیاندنی پەیامی خوای گەورە بە گەنجانی ناوەوەو دەرەوەی کوردستان بەهەردوو زمانی کوردی وفارسی کەپشت بەخوا بەم نزیکانەبەشی عەرەبی دەکرێتەوە .

+ بەشداری کردن لەچەندەها کاری ئاشتەوایی و پێکهێنانی خێزان، هەولێ بەردەوامی رۆژانە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان.

+ ئەم گۆڤارەش خزمەتێکی تری (تواضعی) بەردەستتانە کە پێشت بەخوا سەرەتایەکی خێردەبێت و دەبێتە مایەی هیدایەت و توێشوویەکی بەردەوام بۆ گەنجان و لاوان و چینەکانی تریش، هەوڵ دەدەین لەرەوتی ئیمانداران و دینداران و بێ لایەنانەی خۆمان لانەدەین، بۆیە داوا لە رۆشنبیران و بانگ خوازان و قەڵەم بەدەستان و خەمخۆران دەکەین بۆ بەختەوەرکردنی یەکتر بێن بە پاڵ پشتمان و، گۆڤار گۆڤاری خۆتانەو ئەسپی خۆتانی تیا دا تاوبدەن .. هەروەها داوا لە خێرخوازان دەکەین کە لەرێگەی پڕۆژەی (بەختەوەری) یەوە، چاو لە هەژاران و بێ باوکان نەبڕن و بەردەوام هاریکارییان بکەن بۆئەوەی لەدنیا و لەئاخیرەت بەختەوەری بەدەست بهێنن.

+ دواوتەمان: چی باشمان ئەنجام دابێت و ئەگەر مایەی دڵخۆشی خەڵك بووبێ، ئەواتەنها لەخوای گەورەی دەزانین، ئەگەر کەم و کوڕیشمان هەبووبێت ئەوا ئێمەش بەندەیەکین و شایانی هەڵەین .